# زانستی

# تەجوید


**سیروان حامد**

**مۆڵەتی خوێندنەوەی قورئانی بەریوایەتی (حفص) لە (عاصم)ەوە پێدراوە**


**پێداچوونەوەو پێشەکی**


**د.دیاری أحمد إسماعیل**

**الجامع للقراءات العشر من طريق الشَّاطبيَّة والدُّرَّة**



**چاپی سێیەم**

**١٤٣٥ك - ٢٠١٤ ز**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ (البقرة: ١٢١)

## نزاو پاڕانەوەی خەم و پەژارە

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:**

**[مَا أَصَابَ أَحَدًا قَطُّ هَمٌّ وَلا حَزَنٌ فَقَالَ: (اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ، وَابْنُ عَبْدِكَ، وَابْنُ أَمَتِكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوْ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي، وَجِلاءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي) إِلا أَذْهَبَ اللَّهُ هَمَّهُ وَحُزْنَهُ وَأَبْدَلَهُ مَكَانَهُ فَرَجًا.**

**قَالَ: فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلا نَتَعَلَّمُهَا ؟ فَقَالَ: بَلَى، يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهَا أَنْ يَتَعَلَّمَه]** [1]

**واتە: هیچ کەسێك نییە کەخەم وپەژارەیەکی تووش ببێت و بڵێت:**

**(خوایە من بەندەی تۆم و کوڕی بەندەی تۆم و کوڕی کەنیزەکی تۆم، ناوچەوانم بەدەست تۆیەو بڕیارت بەسەرمدا جێبەجێیە، فەرمانت بەسەرمدا دادپەروەرانەیە، داوات لێدەکەم بەهەموو ناوێك کەهی تۆیەو خۆتت پێ ناو ناوە، یاخود لەکتێبەکەتدا ناردووتەتە خوارەوە، یاخود فێری یەکێك لەدروستکراوەکانت کردووە، یاخود لەعیلمی غەیبدا لای خۆت هەڵتگرتووە، قورئان بکەیتە بەهاری دڵم و نوری سنگم و لابەری خەم و پەژارەم)**

**ئیللا خوای گەورە خەم و پەژارەکەی لادەبات و بۆی دەگۆڕێت بەخۆشی و شادی.**

**دەڵێ: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەبەری نەکەین؟**

**فەرمووی: بەڵێ پێویستە هەرکەسێك کە دەیبیستێت لەبەری بکات.**

---

[1] **رواه أحمد عن ابن مسعود ﷺ برقم : (٣٧١٢ ) وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة: (١٩٩).**

# پێشەکی

الحمد لله والصَّلاة والسَّلام على رسول الله ...

گەر بەوردی سەیری فەرمووده بەنرخەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بکەین کەدەفەرموێت: (خیرُکم من تعلَّمَ القُرآن وعلَّمَهُ) دەردەکەوێت کەئەم (چاکترینە) ئەو کەسانە دەگرێتەوە کەپاش ئەوەی خۆیان فێری قورئان خوێندنەوە دەبن، خەڵکانی تریش فێردەکەن ... دیارە چاکترین زانستیش زانستەکانی قورئانە.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلاً﴾ کەواتە پێویستە قورئان بەجوانی، واتە بەتەجویدەوە بخوێنرێتەوە ...

هەر بۆیە لای زانایان چاکخوێندنەوەی قورئان ئەرکە (واجب)، گەرچی زانینی وردەکاری زانستی تەجوید فەرزی کیفایەیە.. لێرەوە دەردەکەوێت نووسین لەبابەتی تەجویدو بلاْوکردنەوەی ئەم زانستە کارێکی زۆر پیرۆزەو پێویستە گرنگی پێبدرێت، بەتایبەتی لەکردنەوەی خولی فێربوونی تەجویدو چاکخوێندنەوەی قورئان، چونکە تەنها زانستە تیۆریی (نظري)یەکە بۆ فێربوون بەس نییە، بەتایبەتی لەناو ئەو گەلانەی کەعەرەب نین، چونکە دەربڕینی پیتەکانی و دەرهێنان لەجێدەنگەکان (مخرج)ەکانیانەوە کارێکە لەبەردەم مامۆستایانی شارەزادا پێویستی بەڕاهێنان هەیە.

کاتێك برای بەڕێزم (مامۆستا سیروان حامد) داوای لێکردم کەبەسەر چاپی دووەمی کتێبەکەی (زانستی تەجوید)دا بچمەوە، بینیم بەشێوەیەکی زانستیو شارەزایانە بابەتەکانی داڕشتووەو لەکتێبە کوردیەکانی دیکە کەباسی ئەم زانستە دەکەن جیاوازە، بەتایبەتی لەڕێکخستنو ڕیزکردنی بەشەکان و چڕی زانیاریەکانی ووردەکاری تێدا بەکارهاتووە، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ شارەزایی خۆی لەوانە وتنەوەو فێربووندا، کەمامۆستا سیروان مۆڵەت (إجازة)ی خوێندنەوەی قورئانی بەریوایەتی (حَفص) لە (عاصِم)ەوە هەیە، هەروەها زۆری ئەو سەرچاوە بەپێزانەی کە بەکاریهێناوە.

کتێبی (زانستی تجوید) هەرچۆن بۆ خوێندکاران بەسوودە مامۆستایانیش دەتوانن وەك سەرچاوەیەکی گرنگ بەکاریبهێنن، بۆیە گەر وەك پرۆگرامی خولەکانی فێربوونی قورئان بەکاربرێت سوودێکی زۆر دەگەیەنێت.

خوای گەورە پاداشتی نووسەر بداتەوەو بیخاتە تەرازووی چاکەکانی لەڕۆژی دواییداو لەئێمەو ئەویش خۆش بێت.

وآخرُ دعوانا أنِ الحمدُ للهِ ربِّ العالمين

د. دیاری أحمد إسماعيل
الجامع للقراءات العشر من الشَّاطبيَة والدُّرَّة
سلێمانی
٢٣/شعبان/١٤٣٢

## پێشەکی چاپی دووەم

الحمدُ لله الذي بنعمته تتمّ الصَّالحات، والصلاة والسلام على نَبيِّ الرّحمات الذي باتباعه تنال المكرمات، وتتمّ السّعادات في الحياة وبعد الممات، وعلى آله وصحبه دعاة الخير وأئمة الهدى ومصابيح الرّشاد.

وبعد:

سوپاس بۆ خوای بێ وێنەو بیسەرو بینەر، پاش تەواوبوونی[٢] چاپی یەکەمی کتێبی (زانستی تەجوید) لەماوەیەکی کەمدا، بڕیارمدا بۆ جاری دووەم لەچاپی بدەمەوەو گرنگیەکی تایبەتتری پێبدەم، کات و کۆششێکی زیاتری بۆ تەرخانبکەم، بۆیە ئەم چاپە جیاوازە لەچاپی یەکەم ئەویش بە:

١- ڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپ و هەڵە هونەرییەکان.

٢- سەر لەنوێ داڕشتنەوەیەکی تازەم بۆ زۆرێك لەپێناسەکان و بابەتەکانی تری کردۆتەوە.

٣- سوود وەرگرتن لەچەندین سەرچاوەی تری بەهێزو باوەڕ پێکراو کەلەکۆتایی کتێبەکەدا ئاماژەم بۆ کردووە.

٤- زیادکردنی چەندین بابەتی تر وەك: سیفەتی شاراوەیی (الخفاء)و، مینگە (الغنّة)و، وەستان (وقف)ی جبریل و، دەستپێکردن (الإبتداء)و، (الروم والإشمام)و، بڕین (القطع)و، دەنگ بەرزکردنەوە (النَّبر)و ...تاد.

٥- ڕوونکردنەوەی زیاتر بۆ ئەو بابەتانەی کەپێویستییان بەڕوونکردنەوە هەبوو وەك: مەخرەج و سیفەتی پیتەکان و وەستان (الوقف)و ...

٦- گۆڕینی سەرجەم وێنەکان بەوێنەی تازەترو لەگەڵ زیادکردنی هەندێکی تریش.

٧- بەڵگە هێنانەوە بۆ زۆربەی بابەتەکان، ئەویش بەدێڕە شیعرەکانی پێشەوای زانستی تەجویدو قیرائات ئیبنولجەزەری لەپێشەکیەکەیدا، هەندێ جاریش لە کتێبی

---

[٢] چاپی یەکەم (١٥٠٠) دانەی لێ چاپ کرابوو.

(التُحفة)ى (الجمزوري)و، هەروەها (التحفة)ى (السَّمَنُّوديّ)- ڕەحمەتى خوايان لىٚ بێت- ئەمەش لەپێناو پتەوكردنى بابەتەكەو ئاشناكردنى خوێنەر بەو سەرچاوانە.

٨- نووسینەوەى ئايەتەكانى قوڕئانى پیرۆزى ناو ئەم كتێبە بەخەتى (عثماني).

٩-ئەزمونى خۆيشم كە خواى گەورە يارمەتيدام بۆ خوێندنەوەى خەتمێك بەريوايەتى (حفص) لە(عاصم)ەوە، لەخزمەت مامۆستاى بەڕێزو خۆشەويستماندا (د.دياری أحمد)، بێگومان ئەم ئەزمونە تازەيەش زياتر بەم زانستەى ئاشناكردم.

لەكۆتاييدا دوعاى سەرفەرازى دونياو قيامەت بۆ ئەو برا بەڕێزانە دەكەم يارمەتيان دام بۆ دووبارە بەچاپگەياندنەوەى ئەم كتێبە بەتايبەت مامۆستاى بەڕێزمان (د.دياری أحمد) كە ئەرك و زەحمەتى كێشا بۆ پێداچوونەوەى ئەم كتێبە، بێگومان وردبينى و تێبينيەكانى بەڕێزيان كتێبەكەيان پتەوترو بەهێزتركرد، خواى گەورە پاداشتى بەخێرى بداتەوە.

خوايە لەو كەسانە بين قوڕئان دەخوێنن و سنورەكانى دەپارێزن، لەو كەسانە نەبين قوڕئان دەخوێنن و سنورەكانى دەبەزێنن. آمين.

سيروان حامد
هەڵەبجەى تازە
١٤٣٢/٨/٨ - ٢٠١١/٧/١٠
Sirwanbinhamed@gmail.com

## پێشەکی چاپی یەکەم

إنَّ الحمدَ لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا إنه من يهده الله فلا مضلَّ له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمَّداً عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾

(آل عمران:١٠٢)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾ (النساء: ١)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ (الأحزاب: ٧٠-٧١)

أما بعد، فإنَّ أصدقَ الحديث كتابُ الله تعالى، وخيرَ الهدي هَديُ محمّدٍ (ﷺ)، وشرَّ الأمور محدثاتها، وكلَّ محدثة بدعة، وكلَّ بدعةٍ ضلالة، وكلَّ ضلالةٍ في النار.

خوێنەری بەڕێز:

بێگومان یەكێك لەكردەوە پیرۆزو هەرەچاكەكان خوێندنی قورئانی پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ يَرۡجُونَ تِجَٰرَةٗ لَّن تَبُورَ﴾ (فاطر: ٢٩) واتە: بەڕاستی ئەوانەی كە پەڕاوەكەی خوا ئەخوێننەوە و، نوێژی ڕێك و پێك ئەكەن و، لەو ڕۆزییەی پێمان داون بەنهێنیو بەئاشكرا دەبەخشن، بەئومێدی بازرگانییەكن كەهەرگیز لەبرەو ناكەوێ، تاخوای گەورە لەبەرامبەر هەوڵەكانیان بەچاكی پاداشتیان بداتەوەو لەبەهرەی خۆی زێدەشیان بداتێ، چونكە بەڕاستی ئەو لێبوردەو پێزان و پاداشت دەرەوەیە .

پێغەمبەری پێشەوایشمان (ﷺ) دەفەرموێ: (اِقرءُوا القرآنَ فإنَّهُ يأتي يوم القيامةِ شفيعاً لأصحابِه)[٣]. واتە: قورئان بخوێنن چونکە لەڕۆژی دواییدا تکا کارە بۆ خاوەنەکانی.

خوێندنەوەی قورئانیش جیاوازە لەهەموو کتێبێکی تر، چونکە بنەماو یاسای تایبەتی خۆی هەیە، کەپێویستە لەسەر هەموو موسڵمانیك جێ بەجێیان کات لەکاتی خوێندنیدا.

منیش لەسۆنگەی ئایەتی ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ﴾ (المائدة:٢) خوای گەورە یارمەتیدام کە ئەم کتێبە بەناونیشانی (زانستی تەجوید) بخەمە بەردەست دۆستانی قورئانەوە بەهیوای سوود لێ وەرگرتنی.

جائەگەر لەئامادەکردنو وەرگێڕانی بابەتەکەدا پێکابێتم ئەوا فەزڵ و بەخششی پەروەردگارە، ئەگەر کەمو کوڕی تێدابوو ئەوا داوای لێبووردن دەکەمو، داواکارم لەخوای بەبەزەیی بیخاتە تەرازووی چاکەکانم.

دەستخۆشی لەهەر خوشكو برایەك دەکەم کەلەهەر کەمو کوڕیو هەڵەو بیرچوونێك – کەهیچ کەس لێیان بەدوور نابێت– ئاگادارم بکاتەوە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لاإله إلاّ أنت، أستغفرُك وأتوبُ إليك.

سیروان حامد

هەڵەبجەی تازە

٢٢ جمادي الثاني ١٤٣٠ ك – ١٥/ ٦/ ٢٠٠٩ز

---

[٣] دواتر (تخريج)ی دێت.

## بەشی یەکەم
## پێشەکیەکانی زانستی تەجوید

**یەکەم: پێناسەی تەجوید:**

**تەجوید لەزمانەوانیدا: چاککردن وشارەزابوونە.**

**لەزاراوەشدا دەبێت بەدوو بەشەوە:**

**١- تەجویدی زانستی (التجويدُ العِلْميّ): زانینی ئەو بنەماو یاسایانەی کە زانایان دایان ناوەو نوسیویانەتەوە، وەك: شوێنی دەرچوونی پیتەکان، زانینی سیفەتەکانی، ئەحکامەکانی نونو میمی زەننەدارو درێژکردنەوە (المدّ)و بەشەکانی و ... هتد.**

**٢- تەجویدی کردەیی (التجويدُ العَمَليّ): (إخراجُ كلِّ حرفٍ من مخرجه، وإعطاءهُ حقَّهُ ومستحقّهُ.)**

**إخراجُ كلِّ حرفٍ من مخرجه. واتە: دەرکردنی پیتەکان لە جێدەنگی (مخرج) خۆیانەوە.**

**حقَّهُ: ئەوسیفەتانە دەگرێتەوە کەخۆیینو لەپیتەکە جیانابنەوە، وەك: چپەو ئاشکرا (الهمس والجهر)، بەرزی ونزمی (الإستعلاء والإستفال) و ... هتد.**

**مستحقّهُ: ئەوسیفەتانە دەگرێتەوە کە کاتین (عرضي)، لەهەندێ کاتدا تووشی پیت دەبن ولەهەندێ کاتیشدا لێی جیادەبنەوە، وەك: ئاشکراکردن (الإظهار) و تێهەڵکێش (الإدغام) و شاردنەوەو (الإخفاء) و هەڵگەڕاندنەوە (القلب) و بچووککردن (الترقيق) و گەورەکردن (التفخيم).[٤]**

**تێبینی: هیچ کەسێك ناتوانێت لەڕێگەی پەرتووكو کتێبەکانی زاستی تەجویدەوە فێری جۆری دووەم: (التجويد العَمَليّ) ببێت، بەڵکو فێربوونیان تەنها لەڕێگەی مامۆستایانی شارەزاوە (خاوەن سەنەدی نەبچڕاو) دەبێت، ئەویش بەبیستنو بینینو وەرگرتن لێیانەوە.**

---

[٤] بڕوانە: الوجيز في تجويد الكتاب العزيز: د محمد بن سيدي محمد الأمين ل ٢٨، غاية المريد في علم التجويد: عطية قابل نصر ل ٢١.

دووەم: مێژووی نووسینەوەی زانستی تەجوید:

لەڕابردوودا زانستی تەجوید لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا بەزارەکی (شفهي) دەخوێنرا، بەشێوەیەك قوتابی چەند جار قورئانی بۆ مامۆستاکەی دەخوێندەوە تا بەباشی فێری خوێندنەوەی دەبوو، دواتر زانایانمان ڕەحمەتی خوایان لێبێت هاوشێوەی زانستەکانی تر یاساو بنەماکانی ئەم زانستەیان نوسییەوە.

یەکەمین نوسراوی سەربەخۆ لەم بوارەدا هۆنراوەکەی ئەبو موزاحیمی خاقانیە (٣٢٥ك کۆچی دواییکردووە)و لە (٥١) دێڕ پێکهاتووەو زۆرێك لەبابەتەکانی تەجویدی لەخۆگرتووە، بێ ئەوەی زاراوەی تەجویدی تێدا بەکارهێنابێت، چونکە ئەو زاراوەیە تا ئەو کاتە نەناسرابوو.

پاشان ئەسسەعیدیی عەلی کوڕی جەعفەر (٤١٠ك کۆچی دواییکردووە) دوو کتێبی بەناوی (التنبيه على اللحن الجلي واللحن الخفي)و (اختلاف القراء في اللام والنون)ی نووسی، ئیتر بەم شێوەیە زانایان دەستیانکرد بەنووسین لەم بوارەدا، گرنگترینیان:

- الرعاية لتجويد القراءة وتحقيق لفظ التلاوة، مكي بن أبي طالب القيسي (٤٣٧ك کۆچی دوایی کردووە)
- التحديد في الإتقان والتجويد، أبو عمرو الداني (٤٤٤ك کۆچی دوایی کردووە)
- شرح قصيدة أبي مزاحم الخاقاني، أبو عمرو الداني.
- التجويد، أبو الفضل الرازي (٤٥٤ك کۆچی دوایی کردووە).
- المُوضِّحُ في التجويد، عبدالوهاب القرطبي (٤٦٢ کۆچی دوایی کردووە).

(غانم قدوری الحمد) لەکتێبی (الدراسات الصوتية عند علماء التجويد) زیاتر لە (١٠٠) نوسراوی زانایانی لەم بوارەدا ژماردووە کەتا کۆتایی سەدەی سیازدەیەمی کۆچی نوسراون.[٥]

سێیەم: چۆنێتی فێربوونی تەجویدی کردەیی (العملي):

ئەم فێربونە دوو شێوازی هەیە:

١- گوێگرتنی فێرخواز بۆ خوێندنی مامۆستا، ئەمە شێوازی پێشینانە.

٢- گوێگرتنی مامۆستا بۆ خوێندنی فێرخوازو ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی.

---

[٥] المنير في أحكام التجويد ل: (١٠-١١).

واباشترە سوود لەهەردوو شێوازەکە وەربگیرێت، بەڵام ئەگەر کات کەمبوو سوود لەشێوازی دووەم وەردەگیرێت.

چوارەم: گرنگیی تەجوید:

بەڕاستی تەجوید هۆکارێکە بۆ گەیشتن بەمەبەستێك، ئەو مەبەستەش لەم چەند سوودەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:

١- پەرستن و بەجێهێنانی فەرمانی خواو، شوێنکەوتنی پێغەمبەرە (ﷺ) لەچۆنیەتی خوێندنی قوڕئاندا.

٢- دەرکەوتنی ئیعجازی قوڕئان.

٣- ڕوونبوونەوەی جیاوازی نێوان خوێندنەوەی قوڕئان و کتێبی ئاسایی.

٤- جوانکردنی خوێندنەوەو ڕازاندنەوەی.

٥- لەسەر خۆیی و هێواشی کەهەل دەڕەخسێنی بۆ:

أ- تێڕامان و وردبوونەوەو تێگەشتن لەقوڕئانی پیرۆز.

ب- ملکەچبوون بۆ خوا.

ج- دەربڕین بەشێوەیەکی ڕاست و ڕەوان.

٦- بەدیلێکی شەرعی جوانە بۆ مۆسیقاو ... هتد.

٧- فێربوونی شێوازی (عثماني) کەقوڕئانی پیرۆزی پێنوسراوە.

پێنجەم: جوانخوێندنەوەی قوڕئان لەسەر پێنج بنەما بنیاتدەنرێت:

١- زانینی جێدەنگی پیتەکان و پاشان ڕاستکردنەوەی زمان و چاکدەربڕینیان.

٢- زانینی سیفەتی هەمیشەیی و کاتیی پیتەکان و جیاکردنەوەیان لەیەکتر.

٣- زانینی ئەو ئەحکامانەی کە لەئەنجامی لێکدانی پیتەکان دروستدەبن.

٤- زانینی وەستان و دەستپێکردن و ئەوەی پەیوەستە پێیانەوە، چونکە لایەنێکی گرنگی تەجویدن.

٥- ڕاهێنانی زمان و زۆر وتنەوە.

**شەشەم: حوكمی فێربوونی تەجوید:**

**سەبارەت بەحوكمی فێربوونی تەجوید و جێبەجێكردنی یاساكانی زانایان دوو ڕایان هەیە:**

**١- فێربوون و شارەزابوونی ئەم زانستە واتە: (التجويد العلمي) فەرزی كیفایەیە، بەڵام جێبەجێكردنی لەكاتی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا، واتە: (التجويد العَمَلي) فەرزی عەینەو پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك ژن بێت یاخود پیاو لەكاتی قورئان خوێندندا پەیڕەوی بكات، ئەمە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانە.**

**٢- ڕەچاوكردن و جێبەجێكردنی بنەماو یاساكانی ئەم زانستە سوننەتەو پابەندبوون پێوەی لەكاتی قورئان خوێندندا شتێكی باشە، ئەمەش ڕای هەندێك لەشەرعزانانە (الفقهاء)[٦].**

**بەڵام ڕای یەكەم بەهێزترە، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلاً﴾. واتە: زۆر بەجوانی و لەسەر خۆیی قورئان بخوێنەرەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ). واتە: لەئێمە نییە ئەو كەسەی بەدەنگەوە قورئان نەخوێنێت.**

**هەر بۆیە پێشەوا ئیبنولجەزەریش لەپێشەكیەكەیدا وتویەتی:**

وَالأَخْذُ بِالتَّجْوِيدِ حَتْمٌ لازِمُ مَنْ لَمْ يُجَوِّدِ الْقُـرَآنَ آثِمُ
لأَنَّهُ بِهِ الإِلَهُ أَنْـــــــزَلاَ وَهَكَذَا مِنْهُ إِلَيْنَا وَصَـلاَ

**واتە: خوێندنەوەی قورئان بەتەجویدەوە پێویستە، هەركەسێك بەتەجویدەوە قورئان نەخوێنێت تاوانبارە، چونكە پەروەردگار قورئانی بەتەجویدەوە دابەزاندوە، هەر بەو شێوەیەش نەوە بەنەوە بە (تواتر) پێمان گەشتووە.**

---

[٦] (محمد بن صالح العثيمين)یش ڕەحمەتی خوای لێبێت لەكتێبی (شرح رياض الصالحين ل١١٤٠، ١١٥٤)دا ڕای دووەم بەپەسەند دەزانێت!

**حەوتەم: گەورەیی و پاداشتی فێربوونی قورئان و فێرکردنی:**

**١- خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا﴾ (الإسراء: ٩) **واتە: بێگومان ئەم قورئانە خەڵکی بۆ ڕاستترین ڕێچەو بەرنامە ڕێنوێنی دەکات، مژدەی پاداشتێکی زۆر گەورەش بەو بڕوادارانە دەدات کە کارو کردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن.**

٢- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ونحنُ في الصُّفّةِ فقال: (أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ كُلَّ يَوْمٍ إِلَى بُطْحَانَ أَوْ إِلَى الْعَقِيقِ فَيَأْتِيَ مِنْهُ بِنَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ فِي غَيْرِ إِثْمٍ وَلَا قَطْعِ رَحِمٍ فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ نُحِبُّ ذَلِكَ قَالَ أَفَلَا يَغْدُو أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَعْلَمُ أَوْ يَقْرَأُ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ خَيْرٌ لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ وَثَلَاثٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلَاثٍ وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَرْبَعٍ وَمِنْ أَعْدَادِهِنَّ مِنْ الْإِبِلِ؟)[٧] **واتە: (عقبة)ی کوڕی (عامر) دەڵێت: لەکاتێکدا ئێمە لە(الصُّفّة)[٨] دانیشتبووین پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات و فەرمووی: کام لەئێوە حەز دەکات کە هەموو ڕۆژێك سەر لەبەیانی بچێت بۆ (بطحان) یان (العقیق) و دوو وشتری کۆپارە گەورەی قەڵەو لەوێ بێنێتەوە بێ ئەوەی گوناهبار ببێت یاخود دڵی هیچ خزمێکی لێ بئێشێت؟ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموومان حەز بەوە دەکەین. فەرمووی: ئەی ناکرێت هەر یەکێ لەئێوە سەر لەبەیانی بڕوات بۆ مزگەوت و دوو ئایەت لەقورئان فێر ببێت یان بخوێنێت کە باشترە بۆی لەدوو وشتری مێ، سیانیش باشترە بۆی لەسیان و چواریش باشترە بۆی لەچوار، بەئەندازەی ژمارەی ئایەتەکان باشترە بۆی لەوشتر.**

٣- عن عثمانَ بن عفانَ ﷺ قال : قالَ رسولُ اللَّهِ (ﷺ): (خَيرُكُم مَنْ تَعَلَّمَ القُرْآنَ وَعلَّمهُ)[٩]

**واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە قورئان فێر ببێت و کەسانی تریش فێرکات.**

٤- عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول الله (ﷺ): (...ومَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ تَعَالَى يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمْ السَّكِينَةُ وَغَشِيَتْهُمْ الرَّحْمَةُ وَحَفَّتْهُمْ

---

[٧] رواه مسلم: (٧٠٣).

[٨] **جێگایەکی سەرگیراو بووە لەبەشی دواوەی مزگەوتەوە دروست کراوە بۆ ئاوارەو هەندێك لەکۆچەران.**

[٩] رواه البخاري: (٥٠٢٧).

الْمَلَائِكَةُ وَذَكَرَهُمْ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ.)[10] **واتە: هەر کۆمەڵێك کۆببنەوە لەماڵێك لەماڵەکانی خواو قورئان بخوێننەوەو بەیەکتری بڵێنەوە، ئەوا بێگومان ئارامی دادەبەزێت بەسەریانداو، بەزەیی دایان دەپۆشێت، فریشتەکان چواردەوریان دەدەن، خوای گەورەش لای ئەوانەی کەلای ئەون باسیان دەکات.**

٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنْ النَّاسِ) قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ هُمْ؟ قَالَ: (هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ)[11] **واتە: بێگومان خوا لەناو خەڵکیدا دۆستانێکی هەیە. وتیان: کێن ئەوانە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ فەرمووی: ئەوانە قورئانخوێنەکانن، دۆستو هەڵبژێرراوی خوان.**

٦- عن عمرَ بن الخطابِ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قال: (إِنَّ اللَّه يرفَعُ بِهذَا الكتاب أَقواماً ويضَعُ بِهِ آخَرين)[12] **واتە: بێگومان خوا بەهۆی ئەم قورئانەوە چەند گەلو هۆزێك سەربەرز دەکاتو چەندانی تریش نزم ونەوی دەکات.**

٧- عن أبي مسعودٍ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قال: (يَؤُمّ القومَ أقرؤهُم لكتاب الله وأقدمُهم قراءةً)[13] **واتە: ئەوەی پێشنوێژی دەکات بۆ خەڵك باشارەزاترینیان بێت لەخوێندنی قورئاندا.**

٨- عن أبي أمامة قال سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (اِقرَءُوا القرآنَ فإنّهُ يأتي يومَ القيامةِ شفيعاً لأصحابه)[14] **واتە: قورئان بخوێنن چونکە لەڕۆژی دواییدا بۆ خاوەنەکانی تکاکار دەبێت.**

٩- عن عائشة رضي اللَّه عنها قالتْ: قال رسولُ اللَّهِ (ﷺ): (الَّذِي يَقرَأُ الْقُرْآنَ وَهُو ماهِرٌ بِهِ معَ السَّفَرةِ الكرَامِ البررَةِ، والذي يقرَأُ الْقُرْآنَ ويتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُو عليهِ شَاقٌّ له أجْران)[15] **واتە: ئەو کەسەی قورئان بەڕەوانی دەخوێنێتەوە لەگەڵ فریشتە بەڕێزو پاکەکاندایە، ئەو**

---

[10] **رواه مسلم: (٢٦٩٩).**

[11] **رواه أحمد في مسنده وصححه الأرناؤوط: (١٢٣٠١)، وابن ماجة في سننه وصححه الألباني (٢١٥).**

[12] **رواه مسلم: (٨١٧).**

[13] **رواه مسلم: (٦٧٣).**

[14] **رواه مسلم: (٨٠٤).**

[15] **متفق عليه: صحيح البخاري: (٤٦٥٣)، صحيح مسلم: (٧٩٨).**

**کەسەشی قورئان دەخوێنێت و زمانی تەتەڵە دەکات تیایداو لەسەر زاری قورسە دوو پاداشتی هەیە.**

**١٠- عن أَبي موسى الأشْعريِّ ﷺ قال: قال رسولُ اللَّهِ (ﷺ): (مثَلُ المؤمنِ الَّذِي يقْرَأُ القرآنَ مثلُ الأُتْرُجَّةِ: ريحهَا طَيِّبٌ وطَعمُهَا حلْوٌ ، ومثَلُ المؤمنِ الَّذي لا يَقْرَأُ القُرْآنَ كَمثَلِ التَّمرةِ: لا رِيح لهَا وطعْمُهَا حلْوٌ، ومثَلُ المُنَافِقِ الذي يَقْرَأُ القرْآنَ كَمثَلِ الرَّيحانَةِ: رِيحها طَيِّبٌ وطَعْمُهَا مرٌّ، ومَثَلُ المُنَافِقِ الذي لا يَقْرَأُ القرآنَ كَمَثلِ الحَنْظَلَةِ: لَيْسَ لَها رِيحٌ وَطَعمُهَا مُرٌّ)[١٦] واته: نموونەی بڕواداری قورئانخوێن وەك نموونەی نارنجە، بۆنی خۆشەو تامیشی خۆشە، بڕواداری قورئاننەخوێنیش وەك خورما وایە، بۆنی نییەو تامی شیرینە، نموونەی دوو ڕووی قورئانخوێنیش وەك ڕێحانە وایە بۆنی خۆشەو تامی تاڵە، نموونەی دوو ڕووی قورئاننەخوێنیش وەك کوژاڵك وایە، بۆنی نیەو تامیشی تاڵە.**

**١١- عنِ ابن عمر رضي اللَّه عنهما عن النَّبِيِّ (ﷺ) قال: (لا حَسَدَ إلاَّ في اثنَتَيْن: رجُلٌ آتَاهُ اللَّه القُرآنَ، فهوَ يقومُ بِهِ آناءَ اللَّيلِ وآنَاءَ النَّهَارِ، وَرجُلٌ آتَاهُ اللَّه مالاً، فهُو يُنْفِقهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النهارِ)[١٧] واته: ئێرەییبردن تەنها لەدوو شتدا نەبێت دروست نییە: پیاوێك خوا قورئانی پێ خەڵات کردبێ و شەوو ڕۆژو بەردەوام بیخوێنێتەوە، پیاوێکیش خوا سامانی پێبەخشیبێت بەشەو بەڕۆژ بەردەوام لەڕێی خوادا بیبەخشێت.**

**١٢- عنِ البراء بنِ عَازِبٍ ﷺ قال: كَانَ رَجلٌ يَقْرَأُ سورةَ الكَهْفِ، وَعِنْدَه فَرسٌ مَربوطٌ بِشَطَنَيْنِ فَتَغَشَّته سَحَابَةٌ فَجَعَلَت تَدنو، وجعلَ فَرسُه ينْفِر مِنها. فَلَمَّا أَصبح أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ)، فَذَكَرَ له ذلكَ فقال: (تِلكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ للقُرآنِ)[١٨] واته: (البراء) دەڵێت: پیاوێك سورەتی (الكهف)ی دەخوێند، ئەسپێکی لەلابوو بەدوو گوریسی درێژ بەسترابوویەوە، پەڵە هەورێك دایگرتەوەو هەربەسەریەوە دەسووڕایەوەو لێی نزیك دەبوویەوە، ئەسپەکەشی هەر لێی ئەسڵەمیەوە، کەڕۆژ بوویەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی باسکرد، ئەویش فەرمووی: (ئەوە فریشتەکان بوون لەبەر قورئان دابەزیون).**

---

[١٦] **متفق عليه: أخرجه البخاري: (٥٤٢٧)، ومسلم: (٧٩٧).**

[١٧] **متفق عليه: البخاري: (٧٥٢٩)، ومسلم: (٨١٥).**

[١٨] **متفقٌ عليه: البخاري: (٥٠١١)، ومسلم: (٧٩٥).**

١٣- عن ابن مسعودٍ ﷺ قالَ: قال رسولُ اللَّهِ (ﷺ): (منْ قرأَ حرْفاً مِنْ كتاب اللَّهِ فلَهُ حسنَةٌ، والحسنَةُ بِعشرِ أَمثَالِهَا لا أَقول: ﴿الٓمٓ﴾ حَرفٌ، وَلكِن: أَلِفٌ حرْفٌ، ولامٌ حرْفٌ، ومِيمٌ حرْفٌ) [١٩]

**واته: هەركەسێك پیتێك لەپەڕاوەكەی خوا (قوڕئان) بخوێنێت چاكەیەكی بۆ دەنوسرێت، چاكەكردنیش بەدە هێندەی خۆیەتی، من نالێم ﴿الٓمٓ﴾ پیتێكە، بەڵكو ئەلیف پیتێكەو لامیش پیتێكەو میمیش پیتێك.**

١٤- عن النَّوَّاسِ بنِ سَمْعَانَ ﷺ قال: سَمِعْتُ رسولَ الله (ﷺ) يقولُ: (يُؤْتَى بِالْقُرْآنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَهْلِهِ الَّذِينَ كَانُوا يَعْمَلُونَ بِهِ تَقْدُمُهُ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَآلُ عِمْرَانَ» وَضَرَبَ لَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثَلاثَةَ أَمْثَالٍ مَا نَسِيتُهُنَّ بَعْدُ قَالَ: (كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ أَوْ ظُلَّتَانِ سَوْدَاوَانِ بَيْنَهُمَا شَرْقٌ أَوْ كَأَنَّهُمَا حِزْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ تُحَاجَّانِ عَنْ صَاحِبِهِمَا) [٢٠] **واته: (النَّوَّاس)ی كوڕی (سَمعان) دەڵێ: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: (لەڕۆژی قیامەتدا قوڕئان دەهێنرێت لەگەڵ خاوەنەكانی- ئەوانەی كاریان پێكردووە- سوڕەتی (البقرة)و (آل عمران) لەپێشیانەوەیە، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ نموونەی بۆ هێنانەوە هێشتا لەبیرم نەچوونەتەوە، فەرمووی: (وەك دوو پەڵە هەور، یاخود وەك دوو سێبەر كە لەنێوانیاندا ڕووناكی هەیە، یاخود وەك دوو پۆل باڵندە كە باڵیان ڕاخستووە لەئاسماندا، دێن بەرگری لەخاوەنەكانیان دەكەن).**

---

[١٩] روا‌ه الترمذي، بڕوانە: السلسلة الصحيحة: (٣٣٢٧).

[٢٠] رواه مسلم: (٢٥٣).

**هەشتەم: دەنگخۆشکردن لەکاتی قورئان خوێندندا:**

١- عن البراء ﷺ قال: سمعت النَّبي (ﷺ) يقرأ ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ﴾ في العشاء، وما سمعتُ أحداً أحسن صوتاً منه أو قراءة.[٢١] **واتە: گوێم لەپێغەمبەر (ﷺ) بوو کە لەنوێژی خەوتنان سورەتی: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ﴾ی دەخوێندەوە، گوێم لەکەس نەبووە کەوەك ئەو دەنگی خۆش بێت یاخود جوانتر بیخوێنێتەوە.**

٢- عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول الله (ﷺ): (ما أذَنَ الله لشيء ما أذن لنبيٍّ حسن الصوتِ يَتغنَّى بالقرآن يجهرُ به)[٢٢] **واتە: خوای گەورە بیستنی هیچ دەنگێکی، هێندەی دەنگخۆشی پێغەمبەرێك کە بەجوانیو بەئاشکرایی قورئان دەخوێنێت، پێ خۆش نییە.**

٣- عن البراء بن عازب أن رسول الله (ﷺ) قال: (زَيِّنوا القرآنَ بأَصواتِكم؛ فإنَّ الصوتَ الحسنَ يزيدُ القُرآنَ حُسْناً)[٢٣] **واتە: قورئان برازێننەوە بەدەنگەکانتان، بێگومان دەنگی خۆش جوانی زیاتر بە قورئان دەبەخشێت.**

٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ)[٢٤] **واتە: ئەو کەسەی بەدەنگەوە قورئان نەخوێنێت لەئێمە نییە.**

٥- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ لَهُ: (يَا أَبَا مُوسَى لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ.)[٢٥] **واتە: ئەی ئەبو موسا تۆ دەنگێکی خۆشت لەدەنگە خۆشەکانی بنەماڵەی داوود پێدراوە.**

---

[٢١] **رواه البخاري: (٧٣٥)، ومسلم: (٤٦٤).**

[٢٢] **أخرجه البخاري: (٥٠٢٣)، ومسلم: (٧٩٢).**

[٢٣] **رواه أحمد وأبو داود وابن ماجة والحاكم وصححه الألباني في صحيح الجامع: (٣٥٨٠).**

[٢٤] **رواه البخاري: (٧٥٢٧).**

[٢٥] **رواه البخاري: (٥٠٤٨)، ومسلم: (٧٩٣).**

**نۆیەم: گەورەیی‌و پاداشتی قورئان لەبەرکردن:**

١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ إِذَا دَخَلَ الْجَنَّةَ اقْرَأْ وَاصْعَدْ فَيَقْرَأُ وَيَصْعَدُ بِكُلِّ آيَةٍ دَرَجَةً حَتَّى يَقْرَأَ آخِرَ شَيْءٍ مَعَهُ)[٢٦] **واتە: بەقورئانخوێن دەوترێت کاتێك دەچێتە بەهەشتەوە: بخوێنەو سەرکەوە، ئەویش دەخوێنێ‌و بەخوێندنی هەموو ئایەتێك لەبەهەشتدا پلەیەك سەردەکەوێت، تا کۆتا ئایەت کەلەبەریکردووە.**

٢- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (إِنَّ مِنْ إِجْلَالِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ.)[٢٧] **واتە: بێگومان ڕێزگرتن و گەورەیی دانان بۆ خوای گەورە لەڕێزگرتنی پیرو بەساڵاچووی موسڵمان‌و ئەوەی قورئانی لەبەرەو توندڕەوی‌و شلگیری تێدانەکردبێت‌و فەرمانڕەوای دادپەروەر دایە.**

٣- عَنْ أَبِي مُوسَى عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (تَعَاهَدُوا الْقُرْآنَ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ الْإِبِلِ فِي عُقُلِهَا.)[٢٨] **واتە: لەپیاچوونەوەی قورئان بەردەوامبن، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە لەو وشترەی کە جڵەوی بەردەدرێت‌و ناگیرێتەوە خێراتر لەدەستدەردەچێت.**

٤- عن عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قال: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) قَالَ: (لَوْ جُعلَ الْقُرْآنُ فِي إِهَابٍ ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ مَا احْتَرَقَ)[٢٩] **واتە: ئەگەر قورئان بخرێتە ناو پێستێك‌و فڕێبدرێتە ناو دۆزەخەوە ناسوتێت، (هەر ئیمانداریك قورئانی لەبەر بێت ئاگری دۆزەخ نایسوتێنێ، لەشی قورئان لەبەر دەبێتە پێستێك بۆ قورئانەکەی ناو سنگی)**

---

[٢٦] **رواه أبوداود، بڕوانە: السلسلة الصحيحة للألباني: (٢٢٤٠).**

[٢٧] **رواه أبو داود في سننه، وابن أبي شيبة في المصنف، والبيهقي في الشعب وحسّنه ابن حجر في التلخيص الحبير: (١٨١/٢)، والألباني في صحيح أبي داود: ( ٤٠٥٣).**

[٢٨] **متفق عليه: البخاري: (٤٦٤٧)، ومسلم: (٧٩١).**

[٢٩] **رواه أحمد في المسند: (٤ / ١٥١ ، ١٥٥)، والدَّارميُّ في السنن: ( ٢/ ٤٣٠)، وأبو يَعْلى في المسند: ( ٢/ ٣٠٧ )، وحسّنه المناوي في فيض القدير: (٥ / ٣٢٤) والألباني في السلسلة الصحيحة: (٣٥٦٢).**

**٥- وعن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله (ﷺ): (إنَّ الذي ليسَ في جوفه شيءٌ من القرآن كالبيتِ الخَرِب)[٣٠] واته: ئەوکەسەی هیچ لەقورئانی لەسنگدا نییە (هیچی لێ لەبەر نەکردبێت) وەك خانووی وێران وایە.**

---

[٣٠] **رواه أحمد: (١٩٤٧)، والترمذي: (٢٩١٣)، وضعّفه الألباني في ضعيف الجامع برقم: (١٥٢٤)، والأرنؤوط في تحقيقه لمسند أحمد برقم: ( ٤٠٢)، وأبو إسحاق الحويني في فتاويه الحديثية: (٦٤/١).**

**دەیەم: ڕەوشتو ئادابەکانی قوڕئانخوێن:**

**١- نیازپاکی بۆ خوای تاکو تەنهاو دوور کەوتنەوە لەڕووپامایی و شۆرەت:**

**پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **دەفەرموێت:** (من قرأ القرآن فلْيسألِ الله به فإنّه سيجيءُ أقوامٌ يقرؤون القرآنَ يَسألونَ به النّاسَ)[٣١] **واتە: هەرکەسێك قوڕئانی خوێند با داوای لەخوا پێبکات، چونکە لەداهاتوودا خەڵکانێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێننو بەهۆیەوە داوا لەخەڵکی دەکەن.**

**هەروەها دەفەرموێت:** (اقرؤوا القرآنَ ولا تغلُوا فيه ولا تجفوا عنه ولا تأكلوا به ولا تستكثروا به)[٣٢] **واتە: قوڕئان بخوێننو زێدەڕەوی و شلگیری تێدا مەکەنو بەهۆیەوە مەخۆنو سامانی پیێ زیاد مەکەن.**

**هەروەها عوبادەی کوڕی صامیت خوای لێ ڕازیبێت دەڵێ: پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **زۆربەی کات سەرقاڵبوو کاتێك کۆچەرییەك خۆی دەگەیاندە لای، دەیدایە دەست پیاوێك تاکو قورئانی فێرکات، جارێکیان پیاوێکی دایە دەست من لەماڵەوە لەلام دەمایەوەو ئێواران لەخواردنی ماڵەوە خواردنم پێدەداو قورئانم فێردەکرت، دوای گەڕانەوەی بۆلای کەسوکاری کەوانێکی بەخەڵات بۆ ناردم، تا ئێستە لەو کەوانە چاکترو جوانترم نەبینیبوو، منیش ڕۆشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **وتم: چی تێدا دەبینی ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی:** (جَمرةٌ بين كتفيك تقلدْتها أو تعلقتها)[٣٣] **واتە: سکلێکە لەنێوان هەردوو شانتدایە، جا ئیتر لەملی کەیت یاخود هەڵیواسیت.**

**٢- باشتر وایە لەکاتی لەشگرانی و بێ دەستنوێژیدا قوڕئان نەخوێنرێت.**

**٣- پاکوخاوێنی شوێنو لەشو جل وبەرگ.**

---

[٣١] **رواه الترمذي: (٢٩١٧)، وأحمد: ( ١٩٩٤٤ )، وابن أبى شيبة، والطبراني والبيهقي عن عمران بن حُصين، وصحّحه الألباني في السلسلة الصحيحة: (٢٥٧).**

[٣٢] **رواه أحمد، والطبراني، والحاكم، والبيهقي عن عبادة بن الصامت و قال ابن حجر فى الفتح (١٤/٢٨٢): سنده قوي، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة : (٢٦٠).**

[٣٣] **رواه أبوداود وأحمد، وصححه الألباني في صحيح أبي داود: (٢٩١٦)، وشعيب الأرنؤوط في مسند أحمد: (٣/٢).**

٤- پاككردنەوەی دەم بەسیواك:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (إنَّ العبدَ إذا تسوّك ثُمّ قام يُصلّي قام الملك خلفَه فسمع لقراءته فيدنو منه أو كلمة نحوها حتى يضعَ فاه على فيه وما يخرج من فيه شيءٌ من القرآن إلا صارَ في جوفِ الملكِ فَطهّروا أفواهَكم للقرآن)[٣٤] واته: هەربەندەیەك سیواك بەكاربهێنیٚو پاشان نوێژ بكات، فریشتەیەك لەپشتیەوە دەوەستیٚو گویٚ لەخوێندنی دەگرێتو لێی نزیكدەبێتەوە تا وەكو دەم دەخاتە سەر دەمی، ئەو قورئانەی كە لەدەمی دێتەدەرەوە دەچێتە ناو سنگی فریشتەكەوە، كەوابوو دەمتان بۆ قورئان خوێندن پاككەنەوە.

پێشەوا عەلیش خوای لیٚ ڕازیبێت دەڵێت: (إنَّ أفواهَكُم طُرقٌ للقرآنِ فطيّبوها بالسواك)[٣٥] واته: بەڕاستی دەمتان ڕێگایە بۆ قورئان، كەوابوو بەسیواك پاكیبكەنەوە.

٥- سوننەتە ڕوو لەڕووگە (قبلة) بكرێت، بەلاٚم بەپێوەو لەكاتی ڕێكردنداو بەدانیشتنو لەسەر تەنیشتو بەڕاكشانیش دروستە: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ﴾ (آل عمران: ١٩١) واته: ئەو كەسانەی بەپێوەو بەدانیشتنو لەسەر تەنیشتو ڕاكشان یادی خوا دەكەن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (إنّ لكلّ شيء سيّداً وإن سيّدَ المجالس قبالة القبلة)[٣٦] واته: بەڕاستی هەموو شتێك گەورەیەكی هەیە، گەورەی هەموو نشتگەیەكیش بەرامبەر ڕووگەیە.

٦- خوێندنی (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم): خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَـٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ (النحل: ٩٨) واته: گەر ویستت قورئان بخوێنیت، بەر لەوە پەنا بەخوا بگرە لەشەیتانی نەفرین لێكراو.

---

[٣٤] رواه البيهقي عن علي بن أبي طالب: (٣٨/١) وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة: (١٢١٣).
[٣٥] رواه بن ماجة، وصححه الالباني في السلسلة الصحيحة: (١٢١٣).
[٣٦] رواه الطبراني عن أبي هريرة، وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (١٠٧/٣).

٧ – ملکەچبوون و ئارامگرتن و هەستکردن بەگەورەیی ئەو زاتەی فەرمایشتەکەی دەخوێنیتەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الحشر٢١) واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان بۆسەر چیایەك دابەزاندایە، ئەوا لەترسی خوا بەكزۆڵی و وردوخاشبوو دەتبینی، ئێمە لەقورئاندا ئەم نموونانە بۆ خەڵكی دێنینەوە تاوەكو بیربكەنەوەو تێبگەن، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعٗا﴾ (الإسراء: ١٠٩) واتە: هەر كات قورئانیان بۆ بخوێنرێتەوە چەناگە نەوی دەكەن و دەگرین و ئیمانیان زیاتر دەبێت.

٨– وردبوونەوەو تێڕامان لەواتای ئایەتەكانی: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ﴾ (محمد: ٢٤) واتە: ئایا ئەوانە بۆ لەئایەتەكانی قورئان ڕانامێنن و وردنابنەوە، یاخود ئەوانە قوفڵ لەسەر دڵیان دراوە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ (ص: ٢٩) واتە: كتێبێكی پیرۆزەو بۆ تۆمان {ئەی پێغەمبەر (ﷺ)} دابەزاندووە تا لەئایەتەكانی ڕابمێنن، خاوەن ژیری و هۆشیارەكانیش ئامۆژگاری لێوەرگرن.

پێشەوا عەلیش خوای لێ ڕازیبێت دەڵێت: (لا خيرَ في عبادة لا فقهَ فيها، ولا في قراءة لا تدبرَ فيها)[٣٧] واتە: خێر لەبەندایەتیەكدا نییە كە تێگەشتنی تێدانەبێت، هەروەها خوێندنەوەیەكیش وردبوونەوەی تێدانەبێت.

ئیبن عەبباسیش خوای لێ ڕازیبێت دەڵێت: (لَأن أقرأَ البقرةَ في ليلة فأدَّبَّرها وأرتّلها أحبّ إليَّ من أن أقرأ القرآن أجمعَ هَذْرَمَةً)[٣٨] واتە: پێم خۆشترە كە سورەتی (البقرة) لەشەوێكدا

---

[٣٧] إحياء علوم الدين، بتخريج الحافظ العراقي: (٢/ ٤٢).

[٣٨] فضائل القرآن لابن كثير: (١٥٧).

بەتێگەشتنەوەو بەجوانی و لەسەرخۆیی بخوێنمەوە، لەوەی هەموو قوڕئان بەپەلە بخوێنمەوە.

٩- خوێندنەوەی قوڕئان بە لەسەرخۆیی و بێ پەلەکردن و، خەتم نەکردنی لەماوەی سێ شەو کەمتردا: خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلاً﴾ (المزمل:٤) واتە: زۆر بەجوانی و لەسەر خۆیی قوڕئان بخوێنەرەوە.

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: (لا يفقهُ من قرأ القرآن في أقلّ من ثلاث)[39] واتە: گەر کەسێك لەماوەی سێ ڕۆژ کەمتردا قوڕئان بیخوێنێتەوە، لێیتێناگات.

١٠- داواکردنی بەزەیی لەخوای گەورە لەکاتی خوێندنی ئایەتەکانی بەزەیی و پەناگرتن بەخوا لەسزاکانی لەکاتی ئایەتەکانی سزادا:

عن عوف بن مالك الأشجعي ﷺ قال: قمتُ مع رسول الله (ﷺ) ليلةً فقام فقرأ سورة البقرة لا يمرُّ بآيةِ رحمةٍ إلا وَقَفَ فسألَ ولا يمرُّ بآية عذابٍ إلا وَقَفَ فتعوّذَ.[40] واتە: شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نوێژمکرد، سوڕەتی (البقرة)ی خوێند، کاتێك دەگەیشتە ئایەتێك لەئایەتەکانی بەزەیی دەوستاو داوای بەزەییدەکردو کاتێکیش دەگەیشتە ئایەتێك لەئایەتەکانی سزا دەوەستاو پەنای بەخوا دەگرت.

١١- خوێندن بەئاوازو دەنگێکی خۆشەوە، وەك پێشتر باسمانکرا.

١٢- وەستان لەکۆتایی ئایەتەکاندا.

سەبارەت بەچۆنێتی قوڕئان خوێندنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیار کرا لە دایکی ئیمانداران ئوم سەلەمە -خوای لێ ڕازیبێت- ئەویش فەرمووی: كان يقطع قراءته آيةً آيةً ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ ثم يقف، ﴿ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ثم يقف.[41] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکۆتایی ئایەتەکاندا دەوەستا، ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ

---

[39] رواه أحمد وأبو داود والترمذي وابن ماجة، وصححه الألباني في صحيح أبي داود: (١٣٩٠).

[40] رواه أحمد وأبو داود والنسائي، وصححه الألباني في صحيح أبي داود: (٧٧٦).

[41] أخرجه أبو داود برقم: (٤٠٠١)، وأحمد في المسند (٦/ ٣٠٢)، بڕوانە: صحيح الجامع الصغير للألباني: ( ٥٠٠٠).

﴿ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ی دەخوێند پاشان دەوەستا، ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ی دەخوێندو پاشان دەوەستا.

١٣- كار كردن بەفەرمانەكانی قورئان و دووركەوتنەوە لەقەدەغەكراوەكانی.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (سيَخرُجُ أقوامٌ من أمّتي يشرَبون القرآنَ كشُرْبِهمُ اللبن)[42] واتە: لەداهاتوودا لەناو ئوممەتەكەمدا خەڵكانێك پەیدا دەبن قورئان دەخۆنەوە – بیری لێناكەنەوەو كاری پێناكەن و بەسەر زمانیاندا تێدەپەڕێت – وەك چۆن شیر دەخۆنەوە.

ئیبن عومەریش خوای لێ ڕازیبێت دەڵێت : لقد عشتُ برهة من دهرٍ وإنَّ أحدَنا يُؤتى الإيمان قبل القرآن وتنزل السورة على محمّد (ﷺ) فيتعلم حلالها وحرامها... .[43] واتە: هەر یەكێك لەئێمە فێری باوەڕ (الإيمان) دەبوو پێش ئەوەی فێری قورئان بێت، كاتێك سورەتێك بۆ موحەممەد (ﷺ) دەهاتە خوارەوە فێری حەڵاڵو حەرامی دەبووین و لەشوێنی پێویستدا دەوەستاین و تێدەفكراین.

ئیبن مەسعودیش خوای لێ ڕازیبێت دەڵێت: (كَانَ الرَّجُلُ مِنَّا إذَا تَعَلَّمَ عَشْرَ آيَاتٍ لَمْ يُجَاوِزْهُنَّ حَتَّى يَعْرِفَ مَعَانِيَهُنَّ وَالْعَمَلَ بِهِنَّ)[44] واتە: هەر پیاوێك لەئێمە دە ئایەتی لەقورئان لەبەركردایە بەسەریدا تێنەدەپەڕی تاوەكو مانای نەزانیبایەو كاری پێنەكردبایە.

١٤- گوێگرتن و بێدەنگبوون بۆ خوێندنەوەی قورئان.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ (الأعراف ٢٠٤) واتە: ئەگەر قورئان خوێنرا گوێی بۆ بگرن و بێدەنگ بن، بەڵكو خوا بەزەیی پێتانا بێتەوە.

---

[42] صحيح الجامع للألباني: (٢/ ٣٤٠).

[43] رواه البيهقي في سننه: (٥٤٩٦)، والحاكم في المستدرك ( ١٠١ ) وقال: صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي، وصححه الهيثمي في مجمع الزوائد: (١/٤٠٤).

[44] أخرجه الطبري في التفسير وصححه: ( ١/٧٤، ٨٣ )، والحاكم في المستدرك: ( ١/٥٥٧ )، وصححه ووافقه الذهبي.

١٥- نەبچڕاندنی خوێندن مەگەر پێویست كات:

جابیر خوای لێ ڕازیبێت دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چوینە دەرەوە بۆ غەزای (ذات الرقاع) لەوێ پیاوێك ژنی یەكێك لەبێباوەڕەكان دەكوژێت، بێباوەڕەكەش سوێند دەخوات كە وازنەهێنێت تا خوێنی یەكێك لەهاوەڵانی موحەممەد (ﷺ) دەڕژێت، دەڕوا بەشوێنیاندا، پێغەمبەریش (ﷺ) لەشوێنێكدا دادەبەزێت‌و دەفەرمویت: (منْ رجلٌ يكلؤنا)؟ واتە: كێ پاسەوانیمان دەكات؟ پیاوێك لەكۆچەریەكان پیاوێكیش لەپشتیوانان هەستان، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (كونا بفم الشعب) واتە : لەدەم ئەم شیوەدا بن، كاتێك گەشتنە ئەوێ، كۆچەریەكە ڕاكشاو هاوڕێكەی دەستیكرد بەنوێژ كردن، بێباوەڕەكەش هات‌و كاتێك زانی ئەوانن، تیرێكی تێگرتن‌و پێكای، ئەویش تیرەكەی دەرهێناو نوێژەكەی نەبڕی تا سێ تیری لێدا، پاشان چەمایەوەو كڕنوشی برد، پاشان هاوەڵەكەی بێداربوویەوە، كاتێك بێباوەڕەكە دڵنیابوو كەناسیویانەتەوە هەڵهات، كۆچەریەكەش بەهاوڕێكەی ووت: (سبحان الله) بۆچی بێدارت نەكردمەوە؟ وتی: لەخوێندنی سورەتێكدا بووم حەزم نەكرد بیبڕم.[45]

١٦- ڕێزگرتن لەقورئانی پیرۆز:

پێویستە قورئانخوێن زۆر ڕێز لەقورئان بگرێت، نەیخاتە سەر زەوی و هیچیش لەسەری دانەنێت، خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ۝١٣ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ﴾ (عبس: ١٣، ١٤) واتە: (ئایەتەكانی قورئان لەچەندین لاپەڕەی پیرۆزدا هەڵگیراون، بەرزو بڵندو پاك‌و خاوێنن).

١٧- كڕنوشبردن لەكاتی خوێندن یاخود بیستنی ئایەتی كڕنوش (سجدة)دا:

ئەبو ڕافیع دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرە نوێژی شێوانم كرد، ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ی خوێندو كڕنوشی تێدابرد، منیش پێموت: ئەم كڕنوشە چییە؟ فەرمووی: لەپشت ئەبولقاسیمەوە ئەم كڕنوشەم بردووە، بەردەوامیش دەیبەم لەسەری تادەگەم بەخزمەتی.[46]

[45] رواه أبوداود، وحسّنه الألباني في صحيح أبي داود برقم: ( ١٨٢ ).

[46] رواه البخاري: ( ٧٣٤، ١٠٢٤، ١٠٢٨ )، ومسلم: ( ٥٧٨ ).

تێبینی: ئەم کڕنووشبردنە لەنوێژو لەدەرەوەی نوێژیشدا فەرز نییە، بەڵکو سوننەتە، چونکە زەیدی کوڕی ثابیت ﷺ دەڵێ: سورەتی ﴿وَٱلنَّجۡمِ﴾م بۆ پێغەمبەر (ﷺ) خوێندو کڕنووشی تێدا نەبرد.[47]

پێشەوا عومەریش (ﷺ) دەڵێ: (فمن سجد فقد أصاب ومن لم يسجد فلا إثم عليه، إنَّ الله لم يفرضِ السّجودَ إلا أن نشاء)[48] واتە: هەر کەسێ کڕنوش ببات پێکاوێتیو هەرکەسێکیش کڕنوش نەبات تاوانی لەسەر نییە، خوای گەورە فەرزی نەکردووەو ویستی خۆمانە.

لەسەر ڕای بەهێزی زانایان پێویستی بەدەستنوێژو ڕوو لەڕووگە (قبلة)و، سەلام دانەوە نییە، چونکە نوێژ نییە تا ئەمانەی پێویست بێت، ئەوەشی دەڵێت نوێژە بەڵگەی نییە.[49]

ژمارەشیان (١٥) (سجدة)یە لە(مصحف)دا لەکۆتایی ئایەتەکەدا نیشانەی (۩) بۆ دانراوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ۩ ٢٠٦﴾ (الأعراف: ٢٠٦)

٢- ﴿وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعًا وَكَرۡهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ۩ ١٥﴾ (الرعد: ١٥)

٣- ﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ۩ ٥٠﴾ (النحل:٥٠)

٤- ﴿وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعًا ۩ ١٠٩﴾ (الإسراء : ١٠٩)

[47] رواه البخاري: (١٠٢٣)، ومسلم: (٥٧٧).
[48] رواه البخاري: (١٠٢٧).
[49] بڕوانە: المحلى لابن حزم: (١١١/٥)، تمام المنّة للألباني: (٢٧٠/١)، مجموع فتاوي ومقالات بن باز: (٤٠٦/١١).

٥- ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ
نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ ۚ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُ ٱلرَّحْمَـٰنِ
خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ ﴿٥٨﴾ (مريم: ٥٨)

٦- ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ
وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ
ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ (الحج: ١٨)

٧- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ
لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ (الحج:٧٧)

٨- ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُواْ لِلرَّحْمَـٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحْمَـٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ
نُفُورًا ۩ ﴿٦٠﴾ (الفرقان:٦٠)

٩- ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ۩ ﴿٢٦﴾ (النمل: ٢٥)

١٠- ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ
وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ (السجدة:١٥)

١١- ﴿قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى
بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا
فَتَنَّـٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ (ص:٢٤)

١٢- ﴿فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا
يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾ (فصّلت:٣٧)

١٣- ﴿فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ وَٱعۡبُدُواْ۩ ﴿٦٢﴾﴾ (النجم:٦٢)

١٤- ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ۩ ﴿٢١﴾﴾ (الإنشقاق:٢١)

١٥- ﴿كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب۩ ﴿١٩﴾﴾ (العلق:١٩)

**یانزەیەم: جۆرەکانی قورئانخوێندنەوە:**

**١- التحقیق: قورئانخوێندنەوە بەهێواشیو لەسەرخۆیی، لەگەڵ تێرامان و وردبوونەوە لەواتاکانی، بەڕەچاوگرتنی گشت یاساکانی تەجوید.**[50]

**٢- التدویر: شێوازی مامناوەند لەقورئانخوێندنەوە، کە لەلایەن زۆرینەی زانایانو قورئانخوێنانەوە پەسەندکراوە.**[51]

**٣- الحَدْر: قورئانخوێندنەوە بەخێرایی، لەگەڵ ڕەچاوگرتنی یاساکانی تەجویدو (إعراب).**[52]

**خوێندنەوەش بەهەرکام لەم سێ جۆرە دروستەو، لەسایەی ئایەتی: ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلاً﴾ (المزمّل: ٤٠) جێبەجێدەبێتەوە.**[53]

**ئینولجەزەریش لە(الطیِّبةُ النشر)**[54] **دا دەڵێت:**

---

[50] ئەم جۆرە خوێندنەوەیە مەزهەبی ئەو خوێنەرانەیە کە درێژکردنەوە (المدّ)ەکان تەواو تێردەکەن وەك: (ورش) لەڕێگەی (الأزرق)ەوە، (حمزة)و هەروەها (عاصم) لەهەندێك ڕێگەوە، نمونەشیان ئەو خەتمە تۆمارکراوانەیە کەبە (المجوّد) ناسراون وەك خەتمە خاوەکانی هەریەك لە: (الحُصري و المنشاوي و عبدالباسط ).

[51] ئەم جۆرەشیان مەزهەبی ئەو خوێنەرانەن کە درێژکردنەوەی (الجائز المنفصل)و (الواجب المتصل) و(العارض للسکون) و ئاسان (اللین) ( بە(٤) جوڵە دەخوێننەوە، وەك: (ابن عامر)و (الکسائي) و... .

[52] ئەم جۆرەش مەزهەبی ئەو خوێنەرانەن کە درێژکردنەوەی (الجائز المنفصل) بە(٢) جوڵە دەخوێننەوە وەك: (قالون)و (ابن کثیر)و (أبو عمرو)و (أبو جعفر) و (یعقوب) و (ورش) لەڕێگەی (الأصبهاني)یەوە.

بڕوانە: أحکام قراءة القرآن للحصري ل: ٣٢٠-٣٣١، تیسیر علم التجوید ل:٢٢-٢٥، نهایة القول المفید ل: ٢٨-٣٠.

[53] هەندێك لەزانایان پلەی (الترتیل) بەپلەیەکی سەربەخۆ لەدوای پلەی (التحقیق)ەوە دادەنێنو خوێندنەوەش لەهەردووکیاندا بەهێواشیو لەسەرخۆیە، بەوە لێکیان جیادەکەنەوە کەدەڵێن (التحقیق) بۆ فێربوونە، چونکە شێوازێکی خاوترەو یاساکانی تەجوید باشتر تێیاندا جێبەجێدەکرێت، بەڵام (الترتیل) ئەو شێوازەیە کە خوێنەر دوای فێربوونی قورئان لەسەری بەردەوام دەبێت.

[54] طیبة النشر في القراءات العشر ل: ٣٦.

وَيُقْرَأُ الْقُرْآنُ بِـ : التَّحْقِيقِ مَـعْ حَدْرٍ وَتدْوِيرٍ، وَكُلٌّ مُتَّبَعْ
مَعْ حُسْنِ صَوْتٍ بِلُحُونِ الْعَرَبِ مُـرَتَّلاً مُجَوَّداً بِالْعَرَبِي.

**(الزَّمْزَمَة): قورئانخوێن لەبەرخۆیەوەو بەدەنگێکی نزم قورئان بخوێنێت بەشێوەیەك ئەوانەی دەوروبەری بەباشی نەیبیستن. ئەمجۆرە هەندێ لەزانایان باسیان لێوەکردووەو دەڵێن بەشێکە لەشێوازی (الحدْر)[55].**

**(الهَذْرَمَة) یان (الهَذّ): خوێندنەوەی قورئان زۆر بەخێرایی بەجۆرێك كە خوێنەر نەتوانێت ڕەچاوی یاساكانی تەجویدو تێڕامان لەئایەتەكان بكات. بۆیە زانایان بەپشتبەستن بەچەند بەڵگەیەك ئەمجۆرە خوێندنە بەدروست نازانن، لەوانە:**

**جارێكیان پیاوێك دێتە لای ئیبن مەسعود و پێی دەڵێ: من سورەتەكانی (المفصل)[56] لەیەك ركاتدا دەخوێنم. ئیبن مەسعودیش خوای لێ ڕازیبێت دەڵێت:**

هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ !! لَقَدْ عَلِمْتُ النَّظَائِرَ الَّتِى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقْرَأُ بِهِنَّ سُورَتَيْنِ فِى رَكْعَةٍ.[57] **واتە: وەك لەبەركردن و خوێندنەوەی شیعر !! من دڵنیام كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو لەو سورەتانەی – كە لەكورتی و درێژیدا لەیەكەوە نزیكبوون– لەیەك ركاتدا دەخوێند.**

---

[55] **بڕوانە: نهاية القول المفيد في فن التجويد للشيخ محمد نصر ل ٢٨.**

[56] **واتە: لەسورەتی (الحجرات)ەوە تا كۆتایی سورەتی (الناس)ە.**

[57] **متفقٌ عليه: البخاري: (٧٧٥)، ومسلم: (٢٠٤).**

دوانزەیەم: هەڵەکردن (اللَّحْن):

(اللَحْن) لەزمانەوانیدا: هەڵەو لادان لەڕاستی.

لەزاراوەشدا: هەڵەیەکە لەناکاو توشی وتە (لفظ) دەبێتو هەندێجار واتاو ماناو هەندێجاریش یاساکانی خوێندنەوە تێکدەدات.

ئەمیش دەبێت بەدوو بەشەوە:

یەکەم: (اللحنُ الجليّ) هەڵەی ئاشکرا:

هەڵەیەکە لەناکاو توشی وشە دەبێت و یاساکانی خوێندنەوەو شێوازی وشەکە تێکدەدات، جا مانای وشەکە بگۆڕێت یان نا. بۆیە ئەم ناوەشی لێنراوە، چونکە شارەزایانو کەسانی تریش بەئاشکرا هەستیپێدەکەن.

ئەمجۆرە هەڵەیە لەوشەو، پیت و، جووڵەو(حركات)، زەنندا ڕوودەدات:

أ- لەپیتدا کەسیٚ شێوەی هەیە:

١- گۆڕینی پیتێك بەپیتێکی تر، وەك:

گۆڕینی ﴿صِرَٰط﴾ بۆ (صرات) (مانا ناگۆڕێت)

یان ﴿وَأَصَرُّوا﴾ بۆ ﴿وَأَسَرُّوا﴾ (مانا دەگۆڕێت)

٢- زیادکردنی پیتێك بۆ وشەکە، وەك:

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾ بکرێت بە (إيَّاكَ نَعْبُدو) (مانا ناگۆڕێت)

﴿وَلَتُسۡـَٔلُنَّ﴾ بکرێت بە (وَلا تُسْألُنَّ) (مانا دەگۆڕێت)

٣- کەمکردنەوەی پیتێك لەوشەکە، بۆ نموونە: ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ﴾ بکرێت بە (إذا جاءت الطَّامَة الكبرى)

ب- لەوشەدا ئەمیش سیٚ شێوەی هەیە:

١- گۆڕینی وشەیەك بەوشەیەکی تر، بۆ نموونە: ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ بە﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بخوێنرێتەوە.

٢- زیادکردنی وشەیەك لەئایەتێکدا، وەك: ﴿أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٍۖ﴾ بکرێت بە (أو تحرير رقبةٍ مؤمنة)

٣- کەمکردنی وشەیەك لەئایەتێك، وەك: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ بکرێت بە (ولله ما في السموات والأرض).

ج- لەجووڵەو (حرکات) زەنندا: گۆڕینی (ضمّة) بە (فتحة) وەك:

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ بگۆڕرێت بۆ(الحَمْدَ لله) یان بۆ (الحَمْدِ لله). (مانا ناگۆڕێت)

﴿أَنۡعَمۡتَ﴾ بگۆڕرێت بۆ (أَنْعَمْتُ) (مانا دەگۆڕێت)

*حوکمی (اللحن الجلي): ئەمجۆرە (لحن)ە بەتێکڕای دەنگی زانایان حەڕامەو ئەگەر بەئەنقەست بکرێت خاوەنەکەی لەدوا ڕۆژدا سزا دەدرێت، هەروەها لەکاتێکیشدا ئەگەر نەزان بێت‌و کەمتەرخەمیبکات لەهەوڵی فێربووندا، بەلاّم ئەگەر لێی تێکچوو، یان لەپێناوی فێربووندا ئەو هەلاّنەی کرد بەتاوان بۆی نانوسرێت.

دووەم: (اللحن الخفي) هەڵەی شاراوە: هەڵەیەکە لەناکاو توشی وشە دەبێت و یاساکانی خوێندنەوە تێکدەدات، بەلاّم مانا ناگۆڕێت. دەکرێت بەدوو بەشەوە:

أ- بەشێکی خوێنەرانی قورئان بەگشتی هەستیپێدەکەن، وەك وازهێنان لە تێهەڵکێش (الإدغام)و شاردنەوە (الإخفاء)و ئاشکراکردن ( الإظهار)و ... هتد.

ب- بەشێکیشی قورئانخوێنی تەواو شارەزا نەبێت کەسیتر هەستی پێناکات. وەك: زۆر دووبارەکردنەوەی پیتی (ر)، گەورەکردنی پیتی (ل) لەکاتێکدا خۆی بچووکبێت، زیادەڕۆیی لەمینگەکان، کەموزیادکردنی درێژکردنەوەکان... هتد. بۆیە ئەم ناوەشی لێنراوە، چونکە تەنها کەسانی شارەزاو لێهاتوو هەستی پێدەکەن و لای خەڵکانی تر شاراوەیە.

*حوکمی (اللحن الخفي): زانایان هەندێکی بەحەڕامو هەندێکی تریشیان بە(مکروە)ی دەزانن، بەلاّم بەڕای بەهێزی زانایان تەنها لەسەر ئەو کەسانە حەڕامە کە توانای فێربوونیان هەیەو کەمتەرخەمن.[٥٨]

---

[٥٨] بڕوانە: الروضة الندية شرح متن الجزرية: ( ٢/ ٣٣) محمود بن محمد عبد المنعم بن عبد السلام العبد، حق التلاوة ل ٦٥-٦٧.

## بەشی دووەم

## پەناگرتن (الإستعاذة)و ناوی خوا هێنان (البَسْمَلَة)

**یەکەم–پەناگرتن (الإستعاذة):**

**خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ (النحل: ٩٨) **واتە: گەر ویستت قورئان بخوێنیت، لەشەیتانی نەفرین لێکراو پەنا بگرە بەخوا.**

**شێوەکانی:**

١- أعوذُ بالله من الشيطانِ الرجيم.

٢- أعوذُ بالله السّميعِ العليمِ من الشّيطانِ الرّجيم.

**خوای گەورە دەفەرموێ:**

﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٌ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ (فصلت: ٣٦)

٣- أعوذُ بالله من الشّيطانِ الرّجيم من هَمْزِه ونَفْخِه ونَفْثِهِ.

٤- أعوذُ بالله السّميع العليم من الشّيطانِ الرّجيم من هَمْزِه ونَفْخِه ونَفْثِهِ.[٥٩]

**(هَمْزِه) واتە: شێتی و خنکاندنی، (نفْخِه) واتە: پۆزو خۆ بەگەورە زانینی، (نَفْثِه) واتە: شیعرو هۆنراوەی.**

**شوێنی خوێندنی: خوێندنی (الإستعاذة) پێش خوێندنی قورئانی پیرۆزە، بەشێك نییە لەقورئان، بەڵام شێوازی یەکەم لای تێکڕای زانایان پەسەندکراوە.**

**حوکمی (الإستعاذة): وتنی لەلای زۆربەی زانایان (الجمهور) سوننەتە، هەندێکیش دەڵێن (واجب) ئەرکە، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە:** ﴿فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ (النحل: ٩٨)

---

[٥٩] رواه أبو داود والترمذي وصححه الألباني في مشكاة المصابيح: (١/٢٧٠).

**بەرزکردنەوەو نزمکردنەوەی دەنگ لەکاتی خوێندنی (الإستعاذة)دا:**

**لەم کاتانەی خوارەوەدا (الإستعاذة) بەدەنگی بەرز دەخوێنرێت:**

**١- ئەگەر قوڕئانخوێن بەدەنگی بەرز قوڕئان بخوێنێت‌و کەسێکی دیکە گوێی لێبگرێت.**

**٢- لەکاتی فێرکردن‌و وتنەوەی قوڕئانی پیرۆزدا.**

**٣- لەدەستپێکردنی قوڕئان خوێندنی بەکۆمەڵدا.**

**لەم حاڵەتانەی خوارەوەشدا بەدەنگی نزم دەخوێنرێت:**

**١- لەنوێژکردندا، نوێژی تاك بێت یاخود بەکۆمەڵ.**

**٢- کەسێك تەنها بۆ خۆی قوڕئان بخوێنێت، خوێندنەکە بەدەنگی بەرز بێت یان نزم.**

**٣- لەکۆڕی قوڕئان خوێندنی بەکۆمەڵدا، بەمەرجێك یەکەم خوێنەر نەبێت.**

دووەم – ناو هێنانی خوا (البَسْمَلَة):

تەنها یەك شێوەی هەیە كە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ە، پێش قورئان خوێندنە.

**حوكمی خوێندنی لەنێوان سورەتەكانی قورئانی پیرۆزدا:**

حوكمی خوێندنی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لەنێو زانایاندا (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) جیاوازی هەیە، ئەمەش لەسەر بناغەی ئەوەی كەئایا ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ وەك ئایەتێك لەقورئان دادەنرێت یاخود نا، ئەمەش كورتەی بۆچوونەكانیانە:

١- ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەئایەتێك لەگشت سورەتەكان دادەنرێت تەنها سورەتی (التوبة) نەبێت، كەوابوو لەسەر ئەم ڕایە خوێندنی لەنێوان سورەتەكاندا ئەركە (واجب)ە، ئەمە ڕای پێشەوا شافیعییە ڕەحمەتی خوای لێبێت.

٢- ئایەتێكی سەربەخۆیەو بۆ پیرۆزیو سورەتەكانە لەیەكتر جیادەكاتەوە، لەم دیدەوە خوێندنی چاكە (مُستحبّ)، پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەلو عەبدوڵلای كوڕی ئەلموبارەكو توێژەرەوانی مەزهەبی ئەبوحەنیفەو فەرموودەناسانو شەیخولئیسلام ئیبنوتەیمیەو ئیبن بازو ئیبن عوسەیمینە ڕەحمەتی خوایان لێبێت، ئەم تێڕوانینەیان هەیە.[60]

٣- ئایەتێكە تەنها لەسورەتی (الفاتحة)دا.

٤- ئایەتێك نییە لەقورئانی پیرۆز، هەروەك پێشەوا مالیكو ئەبوحەنیفە ڕەحمەتی خوایان لێبێت ئاماژەی بۆ دەكەن.

---

[60] بڕوانە: مجموع الفتاوی (٢٢/٤٠٦)، تفسير العلامة محمد العثيمين: (٢/٤)، تەفسیری ڕامان: ئەحمەد كاكە محمود ل ٦.

تێبینی:

١- هەموو زانایان یەکدەنگن کە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەشە ئایەتێکە لەسورەتی (النمل)[٦١] و، ئایەتیش نییە لەسورەتی (التوبة).

٢- خوێندنی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لەنێوان سورەتەکاندا لەریوایەتی (حفص) لە(عاصم)ەوە، (واتە: ئەوەی کەئەمڕۆ دەیخوێنینەوە) پێویستە (واجب).

## شێوازەکانی خوێندنی (الإستعاذة) و (البسملة) لەکاتی قورئان خوێندندا:

١-جیاکردنەوەی هەرسێکیان (الإستعاذة – البسملة – سورەتەکە) لەیەکدی.

٢- گەیاندنی یەکەم (الإستعاذة) بەدووەمەوە (البسملة)و جیاکردنەوەی دووەم لەسێیەم (سورەتەکە).

٣- جیاکردنەوەی یەکەم (الإستعاذة)و گەیاندنی دووەم (البسملة) بەسورەتەکەوە.

٤- خوێندنەوەی هەرسێکیان بەسەر یەکەوە.

## شێوازەکانی خوێندنی (البسملة) لەنێوان سورەتەکاندا جگە لەنێوان (الأنفال)و (التوبة) سیانن:

١- جیاکردنەوەی هەرسێکیان لەیەکتر، واتە: وەستان لەسەر کۆتایی سورەتەکەو پاشان وەستان لەسەر (البسملة)و پاشان دەستپێکردن بەسورەتی دووەم.

٢- جیاکردنەوەی یەکەمو گەیاندنی دووەم بەسێیەمەوە، واتە: وەستان لەسەر کۆتایی سورەتی پێشوو، پاشان گەیاندنی (البسملة) بەسەرەتای سورەتی داهاتووەوە.

٣- گەیاندنی هەرسێکیان پێکەوە.

بەلاَم ڕووی چوارەم دروست نییە، واتە: گەیاندنی کۆتایی سورەتی پێشوو بە(البسملة)وەو پاشان وەستان لەسەر (البسملة)و پاشان دەستپێکردن بەسورەتی

---

[٦١] ﴿إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ( النمل:٣٠).

دووەم، چونکە شوێنی (البسملة) سەرەتای سورەتە نەك کۆتایی.

**هەروەها شێوەکانی خوێندنی نێوان (الأنفال) و(التوبة)ش سیانن:**

**١- وەستان -بەهەناسەوە- (الوقف ) لەسەر** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾ **و**

**پاشان خوێندنی** ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ...﴾ **بەبێ (بَسملة).**

**٢- گەیاندن (وصل)ی هەردووکیان** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ بَرَآءَة مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ..﴾

**٤- وەستان -بەبێ هەناسە- (السكت) لە سەر وشەی** ﴿عَلِيم﴾ **پاشان خوێندنی** ﴿بَرَآءَة ...﴾.

## بەشی سێیەم

## جێدەنگی پیتەکان ( مخارج الحروف )

ئەم بەشە بەگرنگترین بەشەکانی تەجوید دادەنرێت بۆیە پێویستە قوڕئان خوێن گرنگیەکی تەواوی پێبدات ئەویش بە:

١- ڕاستکردنەوەی جێدەنگی پیتەکان.

٢- پێدانی سیفەتی پیتەکان.

٣- ڕاهێنانی زمان و دەم تاوەکو دەبێتە خوو لەو کەسەدا.

هەر بۆیە ئیبنولجەزەری دەڵێت:

إِذْ وَاجِبٌ عَلَيْهِمُ مُحَتَّـمُ ... قَبْلَ الشُّرُوعِ أَوَّلاً أَنْ يَعْلَمُوا

مَخَارِجَ الْحُرُوفِ وَالصِّفَاتِ ... لِيَلْفِظُوا بِأَفْصَحِ اللُّغَــــاتِ

پێناسەی جێدەنگ (المخرج):

بریتیە لەشوێنی دەرچوونی پیتەکان لەکاتی دەربڕینیاندا، یا ئەوشوێنەی کەدەنگی پیتەکە تێیدا کۆتاییدێتو بەهۆیەوە لەپیتەکانی تر جوودادەبێتەوە. جێدەنگەکانیش دوو جۆرن:

١- جێدەنگی دیاریکراو (المخرجُ المحقّق): ئەو جێدەنگەیە کەپشت دەبەستێت بەبەشێکی دیاریکراو لەبەشەکانی گەروو یا زمان یا هەردوو لێو.

٢- جێدەنگی خەمڵێنراو (المخرج المقدّر): ئەو جێدەنگەیە کە پشت بەشوێنێکی دیاریکراو نابەستێتو لەو هەوایە پێکهاتووە کەلە هەردوو بۆشایی گەرووو دەم دایە، هەر بۆیە قبوڵی زیادکردنو کەمکردن دەکات، ئەم جێدەنگە هەرسێ پیتەکانی درێژکردنەوە (المد)ی لێوە دەردەچێت.

چۆنێتی دۆزینەوەی جێدەنگ:

بۆ دۆزینەوەی جێدەنگی هەر پیتێك لەپیتەکان، (سکون) زەننە یان (شدّة) یەك بدە بەپیتەکەو لەپاش هەمزەیەکی جوڵاو (متحرّك)ەوە بیخوێنەرەوە، لەهەر شوێنێکدا پیتەکە کۆتایی هات ئەوە جێدەنگی پیتەکەیە.

نموونە: بۆ دۆزینەوەی جێدەنگی پیتی (ب) دەڵێین: (أَبْ)، کەواتە جێدەنگی پیتی (ب) هەردوو لێوە.

بەڵام بۆ دۆزینەوەی جێدەنگی پیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ) پیتێکی (فتحة)دار بخەرە پێش پیتی (ألف)و، پیتێکی (ضمّة)داریش بخەرە پێش پیتی (و)، هەروەها پیتێکی (کسرة)داریش بخەرە پێش پیتی(ي). بۆ نموونە: قَال، يقُول، قِيل.

پیتەکانی زمانی عەرەبی (الهجائي): دەبن بەدووبەشەوە:

١- پیتە سەرەکیەکان: کە لەسەر ڕای زۆرینەی زانایان ژمارەیان (٢٩) پیتە، بۆیە (الطّيبي) دەڵێت:

وَعِدَّةُ الْحُرُوفِ لِلْهِجَاءِ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ بِلَا امْتِرَاءِ[٦٢].

(أ، ب، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ، ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ، ف، ق، ك، ل، م، ن، ه، و، لا[٦٣]، ي).

٢- پیتە لاوەکیەکان: بریتیە لەوپیتانەی کەلەنێوان دوو مەخرەجدا دەردەچن و، لەنێوان دوو پیتدا دەخوێنرێنەوە، ژمارەیان هەشت پیتە، بەڵام دوانیان پەیوەندیان بە ریوایەتی (حفص)ەوە نییە بۆیە باسیان لێوە ناکەین:

أ- هەمزەی ئاسانکراو (الهمزة الْمُسَهَّلَة): لەنێوان هەمزەو ئەلیفدا دەخوێنرێتەوە، وەك هەمزەی دووەمی وشەی ﴿ءَاْعْجَمِي﴾ (فصلت: ٤٤)

ب- ئەلیفی لارکراو (الألف الْمُمَالَة): لە نێوان ئەلیفو یائدا (هاوشێوەی پیتی ێ) دەخوێنرێتەوەو تەنها لەم وشەیەدا هاتووە: ﴿مَجْرِبٰهَا﴾ (هود: ٤١)

---

[٦٢] المفيد في علم التجويد شهاب الدِّين أَحمد بن أَحمد بن بدرالدِّين بْن إبراهِيم الطِّيبِيّ ل٤ .

[٦٣] مەبەست لە(لا) لێرەدا پیتی ئەلیفە کە هەمیشە زەنندەدارەو پێشەوەی (مفتوح)ە، لەزمانی عەرەبیشدا پیتی زەنندەدار ناکەوێتە سەرەتاوە بەڵکو پێویستی بەپیتێك هەیە بکەوێتە پێشیەوە، جا زانایانی زمان (لغة) پیتی لامیان لەپێشەوەی داناوە، لەبەر ئەوەی پیتی ئەلیف خزمەتێکی زۆری پێشکەش بەپیتی لامی زەنندەداری ناساندن (تعریف) کردووەو پێویستە ئەمیش خزمەتێك بەپیتی ئەلیف پێشکەشبکات. (وانەکانی دکتۆر أیمن سوید).

ج- ئەلیفی گەورە (الألف المفخمة): ئەو ئەلیفەیە کە بەگەورەبی دەخوێنرێتەوە، ئەویش کاتێك بەدوای پیتێکی بەرزدا هات، وەك: ﴿ٱلطَّآمَّةُ﴾، ﴿خَـٰلِدُونَ﴾.

د- لامی گەورە (اللام المفخمة): ئەویش لەوشەی پیرۆزی (الله)دا. وەك: ﴿عَبۡدُ ٱللَّهِ﴾، ﴿قَالَ ٱللَّهُ﴾

ه- نون و (تنوین)ی شاراوە: بەهۆی تێکەڵبونیان لەگەڵ پیتی دوای خۆیان دەبنە پیتێکی ناتەواوو لاوەکی. وەك: ﴿كُنتُم﴾، ﴿تَنظُرُونَ﴾

و- میمی شاراوە: ئەگەر زەنەداربێت و بەدوایدا پیتی (ب) هاتبێت وەك: ﴿أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ﴾ (البقرة:٣٣)

سوود: لە ڕاستیدا پێناسەی پیتە لاوەکیەکان بەسەر (لامی گەورە، نونی زەنەدار (تنوین)، میمی شاراوە)دا جێبەجێ نابێت، چونکە نە لەنێوان دوو جێدەنگدا دەردەچن، نە لەنێوان دوو پیتدا دەخوێنرێنەوە، بەڵکو پیتی لام تەنها بەگەورەیی دەخوێنرێتەوە، مینگەی هەردوو پیتی نون و میمیش جێدەنگیان کەپووە (الخیشوم).[٦٤]

[٦٤] بڕوانە: نهایە القول المفید ل٥٠.

ژمارەی جێدەنگەکان:

لەسەر ڕای زۆرینەی قوڕئانخوێنان (جمهور القرّاء) جێدەنگی پیتەکان حەڤدە جێدەنگن کەپێیان دەگوترێت: (جێدەنگە تایبەتەکان)، ئەم بۆچوونەش لەلایەن خەلیلی کوڕی ئەحمەدی ئەلفەڕاهیدی و ئیبنولجەزەری (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) پەسەند کراوە.

ئیبنولجەزەری لەپێشەکیەکەیدا دەڵێت:

مَخَارِجُ الحُروفِ سَبْعَةَ عَشَرْ          عَلَى الْذِي يَخْتَارُهُ مَنِ اخْتَبَرْ.

خوێنەری بەڕێز، ئەم حەڤدە جێدەنگە تایبەتانە بەسەر پێنج جێدەنگی گشتیدا دابەشدەبن، کە ئەمانەن:

١- هەردوو بۆشایی گەرووو دەم (الجوف) (یەك جێدەنگ)

٢- گەروو (الحلق) (سێ جێدەنگ)

٣- زمان (اللسان) (دە جێدەنگ)

٤- هەردوو لێو (الشّفتان) (دوو جێدەنگ)

٥- کەپوو (الخیشوم) (یەك جێدەنگ)



**جێدەنگی یەکەم: هەردوو بۆشایی گەروو و دەم (الجوف)**

**بریتیە لەبۆشایی گەرووو دەم، کە پیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ) لەخۆدەگرێت و ئەمانەن:**

**أ-(ئەلیف)ی زەنندار پیتی پێشەوەی سەری (فَتْحَة) هەبێت، وەکو: (قَالَ).**
**ب-(واو)ی زەنندار پیتی پێشەوەی بۆری (ضَمَّة) هەبێت، وەکو: (يقُولُ).**
**ج-(ي)ی زەنندار پیتی پێشەوەی ژێری (كَسْرَة) هەبێت، وەکو: (قِيلَ).**

**ئەم سێ پیتەش لەهەریەك لەم وشانەدا کۆبونەتەوە:**

﴿أُوذِينَا﴾ **(الأعراف:١٢٩)**، ﴿نُوحِيهَا﴾ **( هود : ٤٩)**، ﴿ءَاتُونِي﴾ **(الكهف: ٩٦).**

**ئەم جێدەنگەش (تقديري) خەمڵێنراوەو شوێنێکی دیاریکراوی نییەو هەردوو بۆشایی گەروو و دەم دەگرێتەوە، بەپیتە هەواییەکان (الحروف الهوائية)یش ناودەبرێن، چونکە بەکۆتایی هاتنی هەوا لەدەمدا کۆتاییان دێت، هەر بۆیە شیاوی زیادکردن و کەمکردنیشن.**

**ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

فَأَلِفُ الجَوْفِ وأُخْتَاهَا وَهِي          حُرُوفُ مَدٍّ لِلْهَوَاءِ تَنْتَهِي.



**جێدەنگی (الجوف) کە بەشینو سەوز ڕەنگکراوە**



**جێدەنگی دووەم: گەروو (الحلق)**

**لە گەروودا سێ جێدەنگ بۆ شەش پیت هەیە:**



**جێدەنگی گەروو بەشین دیاریکراوە**

**١- دوورترینی گەروو (أقصى الحلق): (کەلە سنگەوە نزیکە)، هەردوو پیتی (الهمزة:ء)و (هـ)ی لێدەردەچێت، بەڵام جێدەنگی (ء) دوورترە لەجێدەنگی (هـ).**

**نموونە:** ﴿أَحَدٌ﴾، ﴿هَٰٓؤُلَآءِ﴾، ﴿سُبِلَ﴾، ﴿كَٱلۡعِهۡنِ﴾، ﴿وَرَحۡمَةٌ﴾



٢- ناوەڕاستی گەروو (وسط الحلق): کەهەردوو پیتی (ع)و (ح)ی لێدەردەچێت، بەڵام جێدەنگی (ع) دوورترە لەجێدەنگی (ح).

نموونە: ﴿وَعُيُونٍ﴾، ﴿يَعْلَمُونَ﴾، ﴿فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ﴾، ﴿حَصْحَصَ﴾.







٣- نزیکترینی گەروو (أدنى الحلق): (کەلەدەمەوە نزیکە)و هەردوو پیتی (غ)و (خ)ی لێدەردەچێت، بەڵام جێدەنگی (خ) لەدەمەوە نزیکترە وەك لەجێدەنگی (غ).

نموونە: ﴿يَغْشَىٰ﴾، ﴿تَخْشَىٰ﴾







ئینولجەزەری سەبارەت بەپیتەکانی گەروو دەڵێت:

ثُمَّ لأَقْصَى الحَلْقِ هَمْزٌ هَاءُ ثُمَّ لِوَسْطِهِ فَعَيْنٌ حَاءُ

أَدْنَاهُ غَيْنٌ خَاؤُهَا......... .....................

## جێدەنگی سێیەم: زمان (اللسان)

### زمان و بەشەکانی:




کەواتە زمان بەگشتی دەبێت بەچوار بەشەوە:

(١) دوورترینی زمان: دوو جێدەنگی بۆ هەردوو پیتی (ق، ك) تێدایە.

(٢) ناوەڕاستی زمان: یەك جێدەنگی بۆ هەرسێ پیتی (ج، ش، ي) تێدایە.

(٣) قەراخی زمان: دوو جێدەنگی بۆ هەردوو پیتی (ل، ض) تێدایە.

(٤) پێشەوەی زمان: پێنج جێدەنگی کە یازدە پیت لەخۆ دەگرێت.[٦٥]

جێدەنگە تایبەتەکانی زمانیش (١٠) جێدەنگن‌و (١٨) پیت لەخۆ دەگرن:

١- دوورترینی زمان (أقصى اللسان): (کە لەگەرووەوە نزیکە) لەگەڵ ئەوبەشەی کەبەرامبەریەتی لەئاسمانەی دەم، ئەم جێدەنگەش پیتی (ق)ی لێدەردەچێت.

[٦٥] تیسیر الرحمن ل: ٥٤.

**٢- دوورترینی زمان (أقصی اللسان) کەمێك پێش جێدەنگی (ق) لەگەڵ ئەوبەشەی بەرامبەریەتی لەئاسمانەی دەم، ئەم جێدەنگەش پیتی (ك)ی لێدەردەچێت.**

**کەواتە پیتی (ق) لەگەرووەوە نزیکەو لەدەمەوە دوورە، پیتی (ك)یش لەگەرووەوە دوورەو لەدەمەوە نزیکە.**

**نموونە:** ﴿ٱلۡحَقُّ﴾، ﴿بِكُفۡرِكَ قَلِيلاً﴾، ﴿يُدۡرِككُّم﴾.




**ئینولجەزەری لەبارەی ئەم دوو پیتەوە دەڵێت:**

| | |
|---|---|
| والْقَافُ...................... | أَقْصَى اللِّسَانِ فَوْقُ ثُمَّ الْكَافُ |
| أَسْفَلُ...................... | ............................ |

٣- ناوەڕاستی زمان (وسط اللسان) لەگەڵ ئەو بەشەی بەرامبەریەتی لەئاسمانەی دەم، ئەم جێدەنگەش سێ پیتی لێدەردەچێت: (ج) و (ش) و (ي) گەر درێژکردنەوە (المدّ) نەبێت. ﴿ٱجۡتُثَّتۡ﴾، ﴿شَطَطًا﴾، ﴿وَذُرِّيَّتِهِمۡ﴾










ئینولجەزەریش دەڵێت:

.......... وَالْوَسْطُ فَجِيمُ الشِّينُ يَا ..............................

تێبینی:

یەکەم: مەبەست لەپیتی (ي) لێرەدا: پیتی درێژکردنەوە (المدّ) نەبێت، بەڵکو بزواو (متحرّك) یان (ساكن) زەنندەدار بێتو پێشەوەی ژێر (كسرة)ی نەبێت.

﴿يَعۡلَمُونَ﴾، ﴿يُوقِنُونَ﴾، ﴿يَدَيِ ٱللَّهِ﴾، ﴿عَلَيۡهِمۡ﴾.

دووەم: لەکاتی دەربڕینی پیتی (ج)دا پێویستە ناوڕاستی زمان بەبەشی سەرەوەی پووکەوە بنووسێت، بەڵام بۆ پیتی (ش، ي) زمان بەپووکدا نانوسێتو تەنها لێی نزیکدەبێتەوە.

سوود: خوێنەری بەڕێز، پێش باسکردنی جێدەنگەکانی تر پێویستە هەندێ زانیاری لەبارەی ددانەکانەوە بزانیت.

مرۆڤ خاوەنی (٣٢) ددانە بەم شێوەیەی خوارەوە:

– برەڕ (الثنايا): چوار ددانەکەی پێشەوە، دوو لەسەرەوە و دوانیش لەخوارەوە.

– تەنیشتە برەڕ (الرَّباعيات): ئەمیش چوار ددانە دوو لەسەرەوە و دوانیش لەخوارەوە.

– کەڵبە (الأنياب): ئەمیش چوار ددانە بەهەمان شێوە.

– خڕێ (الأضراس): ئەمیش بیست ددانە دەبێت بەسێ بەشەوە:

یەکەم: پێکەنین (الضواحك) ئەو ددانانەی لەکاتی پێکەنیندا دەردەکەون، ژمارەیان چوارە لەدوای کەڵبەکانەوە دێن.

دووەم: هارەڕ (الطواحن) یان (الطواحين): دوازدە ددانی سەرو خوارەوەی لاشەویلگەکان، لەهەر لایەك سێ ددان.

سێیەم: ددانی ژێری (النواجذ): ئەمانیش چوارن. [٦٦]

هەندێ لەزانایان بەهۆنراوە ددانەکانیان باسکردووە:

| | |
|---|---|
| للإنسان أسنان ثنايا رباعيـــه | وأنياب كل كالضواحك أربع |
| طواحن ضعف الست أربعة أخر | نواجذ فاعلمها إذ العلم أرفع. |

---

[٦٦] بڕوانە: الروضة النديّة شرح متن الجزرية: (٩/٢)، تاج العروس ل ( ٦٧٤١).




٤- یەکێك لەلێوارەکانی زمان (حافة اللسان) یان هەردووکیان لەگەڵ دیوی ناوەوەی دانەخڕێکانی سەرەوە (الأضراس العليا)، هەستیارترین پیتی زمانی عەرەبی لێدەردەچێت، ئەویش پیتی (ض)ە، بەڵام لێواری چەپی زمان لەگەڵ دانەخڕێکانی لاتەنیشتی زیاتر بەکاردەهێنرێتو ئاسانترە، لای ڕاست کەمتر بەکاردەهێنرێتو قورسترە، بەکارهێنانی هەردوولاش بەهێزترو ناوازەترە.

نموونە: ﴿ضَلَـٰلِ﴾، ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ﴾، ﴿وَخُضۡتُمۡ﴾



ئەو ئەندازەیەی کەپیتی (ض) سەرقاڵی دەکات لەدوو لێواری زمان




**سوود: فەرموودەی: (أنا أفصح من نطق بالضاد) واتە: من ڕەوانبێژترین کەسم کەپیتی ضادی دەربڕیبێت.**

**هەردوو پێشەوا: (ابن کثیر)و ئیبنولجەزەری دەڵێن: لا أصل له. [٦٧] واتە: هیچ بنەمایەکی نیە، بەلاّم بێگومان واتای فەرموودەکە ڕاستە.**

**ئیبنولجەزەریش سەبارەت بەجێدەنگی پیتی (ض) دەڵێت:**

وَالضَّادُ مِنْ حَافَتِهِ إِذْ وَلِيَا ..............................

لَاضْرَاسَ مِنْ أَيْسَرَ أَوْ يُمْنَاهَا .........................

[٦٧] بڕوانە: تفسیر ابن کثیر: ( ١/ ١٤٣)، النشر في القراءات العشر: (٢٤٨/١).

٥- نزيكترينى هەردوو لێوارى زمان (أدنى حافتي اللسان) لەگەڵ پووكى ددانەكانى سەرەوە (هەردوو دانى پێكەنين (الضواحك)و كەڵبەو تەنيشتە بڕەڕو بڕەڕ)، ئەميش پيتى (ل)ى لێدەردەچێت.

ئەم پيتە فراوانترين جێدەنگى هەيە، دەشتوانرێ يەك لاى زمان بەكاربهێنرێ بەڵام لاى ڕاست ئاسانترە بەپێچەوانەى جێدەنگى (ض)ەوە .

﴿وَلۡيَتَلَطَّفۡ﴾، ﴿سُلۡطَٰنٍ﴾، ﴿ٱلۡأَذَلَّ﴾

ئيبنولجەزەريش دەڵێت:

........................ وَاللاَّمُ أَدْنَاهَا لِمُنْتَهَاهَا











٦- پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ ئەو بەشەی کەبەرامبەریەتی لەپووکی هەردوو دانی بڕەڕی سەرەوە، کەمێك خوار جێدەنگی لام، ئەمیش پیتی (ن)ی ئاشکرای لێدەردەچێت.

نموونە: ﴿نَسْتَعِينُ﴾، ﴿نُجِى﴾، ﴿نَاصِيَةٍ﴾

تێبینی: پیتی نونی شاراوە پیتێکی ناتەواوەو جێدەنگی نزیکی جێدەنگی ئەوپیتەیە کەتیایدا دەیشاریتەوە لەگەڵ پشتبەستن بەکەپوو (خیشوم).
جێدەنگی نونی تێهەڵکێشکراویش دەگۆڕێت بۆ جێدەنگی پیتی دوای خۆی.[٦٨]




ئینولجەزەریش دەڵێت:

وَالنُّونُ مِنْ طَرَفِهِ تَحْتُ اجْعَلُوا ..............................

[٦٨] بڕوانە: تیسیر الرحمن في تجوید القرآن: د سعاد عبدالحمید ل ٥٩.

٧- **پێشەوەی زمان (طرف اللسان)و بەشێکی کەمیش لەپشتی زمان لەگەڵ ئەو بەشەی کەبەرامبەریەتی لەپووکی دوو دانی بڕەڕی سەرەوە، کەمێك خوار جێدەنگی لام، ئەمیش پیتی (ر)ی لێدەردەچێت.**

﴿يَتِرَكُم﴾، ﴿مُسۡتَقَر﴾، ﴿ٱلرَّحۡمَـٰن﴾، ﴿يُصۡدِرَ ٱلرِّعَآءُ﴾













**ئینولجەزەریش دەڵێت:**

.............................. وَالرَّا يُدَانِيهِ لِظَهْرٍ أَدْخَلُوا.

**٨- پێشەوەی زمان (طرف اللسان) لەگەڵ پووکی بڕەڕی سەرەوە هەرسێ پیتی: (ط، د، ت)ی لێدەردەچن، بەڵام جێدەنگی (ط) دوورترینیانە لەبڕەڕو پاشان (د)و پاشانیش (ت).**

﴿ٱصۡطَفَىٰ﴾، ﴿طِينٖ﴾، ﴿طَاب﴾

**ئینولجەزەریش دەڵێت:**

............................ ............... والصفَّيرُ مُسْتَكِنْ

مِنْهُ وَمِنْ فَوْقِ الثَّنَايَا السُّفْلَى ................................






٩- پێشەوەی زمان (طرف اللسان)و بەشی سەرەوەی ددانەکانی بڕەڕی خوارەوە،[٦٩] لەگەڵ هێشتنەوەی بۆشاییەکی تەسك بۆ چوونە دەرەوەی هەوا، ئەم جێدەنگەش هەرسێ پیتی (س، ص، ز)ی لێدەردەچێت. بەڵام بۆشاییەکە لەپیتی (ص)دا تەسکترەو لەپیتی (ز)دا زیاترەو لەپیتی (س)دا مامناوەندە.

﴿أَصۡدَق﴾، ﴿صَلۡصَٰل﴾، ﴿ٱلۡمَسۡجِد﴾، ﴿بَسۡطَةً﴾، ﴿كَنَزۡتُم﴾، ﴿فعَزَّزۡنَا﴾

ئینولجەزەریش دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ............................. | والصَّفِيْرُ مُسْتَكِنْ ............. |
| مِنْهُ وَمِنْ فَوْقِ الثَّنَايَا السُّفْلَى | ............................... |







[٦٩] هەندێکیش لەزانایان گوتویانە بڕەڕەکانی سەرەوە، هەندێکی تریش گوتویانە نێوان هەردوو بڕەڕەکان، هۆی ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ زانای گەورە (سیبویە) ڕەحمەتی خوای لێبێت، چونکە ئەو دەستنیشانی نەکردووە، بەڵکو زانایانی دوای خۆی قسەیان لێوە کردووە.

بڕوانە: الجامع الكبير في علم التجويد ( ل ٤١٦-٤١٨ ).

**١٠- پێشەوەی زمان (طرف اللسان)و بەشی خوارەوەی بڕەڕەکانی سەرەوە کە هەرسێ پیتی: (ث، ذ، ظ)ی لێدەردەچێت. بەلاّم دەرکردنی زمان بۆ دەرەوە لەپیتی (ث)دا زیاترە لەدوو پیتەکەی تر، لەپیتی (ذ)یشدا زیاترە لەپیتی (ظ).**[٧٠]

﴿ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ﴾، ﴿أَثۡخَنتُمُوهُمۡ﴾، ﴿ٱتَّخَذۡتُمُ﴾، ﴿ذِی ٱلذِّكۡرِ﴾، ﴿عَظِیم﴾، ﴿أَوَعَظۡتَ﴾

**ئینولجەزەریش دەڵێت:**

| | |
|---|---|
| ........................ | وَالظَّاءُ وَالذَّالُ وَثَا لِلْعُلْيَا |
| مِنْ طَرَفَيْهِمَا ............ | ........................ |







---
[٧٠] بڕوانە: نهاية القول المفيد في علم التجويد ل ٥٨.

جێدەنگی چوارەم: هەردوو لێو (الشَّفتان):

ئەم جێدەنگە دوو جێدەنگی تایبەت بۆ چوار پیت لەخۆدەگرێت:

١- نێوان هەردوو لێو کە ئەم پیتانەی لێوە دەردەچێت:

أ - هەردوو پیتی (ب، م): ئەویش بەداخستنی هەردوو لێو، بەڵام داخستنی هەردوو لێو لەپیتی (ب)دا زیاترە.

﴿بُيُوتٍ﴾، ﴿تَرَبَّصُوا﴾، ﴿بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ﴾، ﴿سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشًا﴾

تێبینی: هەندێ زانایان بۆ جیاکردنەوەی جێدەنگی (ب)و (م) لەیەکتر وتوویانە پیتی (ب) پیتێکی دەریایی (بحرية)یە، پیتی (م) یش پیتێکی وشکایی (بريّة)یە. واتە: لەکاتی داخستنی هەردوو لێودا بۆ پیتی(ب) پێویستە هەردوو دیوی ناوەوەی لێو (واتە: تەڕایی دیوی ناوەوەی هەردوو لێو) بەریەك بکەوێت، بەڵام لەکاتی داخستنی هەردوو لێودا بۆ پیتی(م) پێویستە هەردوو دیوی دەرەوەی لێو (واتە: وشکایی هەردوو دیوی دەرەوەی لێو) بەریەك بکەوێت.[٧١]







[٧١] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن للحصري ل ٦٧.

ب- پیتی (و): گەر پیتی درێژکردنەوە (المدّ) نەبێت، ئەویش بەکردنەوەو خڕکردنی هەردوو لێو.

تێبینی: مەبەست لەپیتی (و) کاتێك درێژکردنەوە (المدّ) نەبێت، ئەمانەیە:

- (و)ی (فتحة)دار: ﴿وَهُوَ﴾، ﴿كُفُوًا﴾

- (و)ی (ضمّة)دار: ﴿ٱلْوُثْقَىٰ﴾، ﴿تَلْوُۥٓا۟ ﴾

- (و)ی (كسرة)دار: ﴿وِقْرًا﴾، ﴿وِزْرًا﴾

- (و)ی زەنندەدار بەدوای سەردا (فتحة) هاتبێت: ﴿يَوْمِهِمِ﴾، ﴿قَوْلُهُم﴾






٢- بەشی ناوەوەی لێوی خوارەوە لەگەڵ لێواری بڕەڕەکانی سەرەوە، ئەمیش پیتی (ف)ی لێدەردەچێت. ﴿ٱلۡغَفَّٰر﴾، ﴿يُوسُفَ فَدَخَلُواْ﴾




ئینولجەزەریش دەڵێت:

...... وَ مِنْ بَطْنِ الشَّفَــهْ: فَالْفَا مَعَ اطْرَافِ الثَّنَايَا الْمُشْرِفَهْ

لِلشَّفَتَيْنِ: الْوَاوُ بَاءٌ مِيـــمُ ................................

**جێدەنگی پێنجەم: کەپوو (الخیشوم):**

**کەپوو (الخیشوم): ئەو کونەیە کە لوت دەگەیەنێت بەگەروو، ئەم جێدەنگەش مینگەی (الغنّة) لێدەردەچێت.[٧٢]**

**ئینولجەزەریش وتویەتی:**

وَغُنَّةٌ: مَخْرَجُهَا الْخَيْشُومُ.   ........................

**تێبینی: مینگە پیتێك نییە بنوسرێتو شێوەشی نییە، لەبەرئەوە هەندێك لەزانایان ڕەخنەیان لە ئیبنولجەزەری گرتووە کە بەپیتێکی خاوەن جێدەنگ دایناوە! بۆیە باشتر وایە بەسیفەت یان بەپیتێکی لاوەکی ئەژماربکرێت[٧٣].**







---

[٧٢] پشت بەخوا لەکۆتایی سیفەتی پیتەکاندا بەدرێژی باسی مینگە دەکەین.

[٧٣] بڕوانە: تیسیر الرحمن في تجوید القرآن ل ٦٢– ٦٣.

## نازناوی پیتەکان (أَلقابُ الحروف)

پیتەکانی زمانی عەرەبی بەگوێرەی شوێنی دەرچوونیان لەجێدەنگەکانیانەوە نازناویان پێدراوە، یەکەم کەس خەلیلی کوڕی ئەحمەدی ئەلفەڕاهیدی بوو لەکتێبەکەیدا بەناوی (العین) نازناوی بۆ پیتەکان دانا، کەئەمانەن:

١- پیتەکانی بۆشایی (الحروف الجوفية): بەهەریەکێك لەسێ پیتەکەی درێژکردنەوە (المدّ): ( ـَا، ـُو، ـِي) دەوترێت، چونکە جێدەنگیان بۆشایی دەم و گەرووە.

٢- پیتە هەواییەکان (الحروف الهوائية): ئەمیش هەر بەپیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ) دەگوترێت چونکە بەکۆتایی هاتنی هەوا لەدەمدا کۆتاییان دێت.

٣- پیتەکانی گەروو (الحروف الحلقية): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ء، ه، ع، ح،غ ، خ) دەگوترێت، چونکە لەگەرووەوە دەردەچن.

٤- پیتەکانی گەلالوچ[٧٤] (الحروف اللَّهَوية): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ك، ق) دەگوترێت، چونکە جێدەنگیان لەگەلالوچەوە (اللَّهَاة) نزیکە.

٥- پیتە شەویلگەییەکان (الحروف الشَّجْرِيّة): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ج، ش، ض، ي) دەوترێت، چونکە لەپاڵ کەلێنی نێوان هەردوو شەویلگەدان.

٦- پیتەکانی سەری زمان (الحروف الذَّلْقِية) یاخود (الذَّلَقِية): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ل، ن، ر) دەوترێت، چونکە جێدەنگیان سەری زمانە (ذَلْق اللسان).

٧- پیتەکانی پێشەوەی مەلاشوو (الحروف النِّطَعيّة): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ط، ت، د) دەوترێت، چونکە جێدەنگیان پێشەوەی ئاسمانەی دەم یا مەلاشوو (نطع الحنك)ە.

٨- پیتەکانی باریکایی زمان (الحروف الأَسَلِيَّة): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ص، ز، س) دەوترێت، چونکە جێدەنگیان باریکایی زمانە (أسلة اللسان).

---

[٧٤] اللهاة واتە: گەلالوچ، بڕوانە: فەرهەنگی پزیشکی خوێندکار د. هیوا عمر ل ١٨٢، فەرهەنگی پزیشکی کارینا ل ٣٢٠.

بەڵام لەنێو کوردەواریدا پێی دەڵێن زمانە بچکۆلە!

٩- پیته پووکیەکان (الحروف اللِّثویة): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ظ، ذ، ث) دەوترێت، چونکە لەنزیك پووکەوە دەردەچن.

١٠- پیته لێویەکان (الحروف الشَّفَویّة) یان (الشَّفهیَّة): بەهەریەکێك لەپیتەکانی (ف، و، ب، م) دەگوترێت، چونکە جێدەنگیان هەردوو لێوە.

## بەشی چوارەم
## سیفەتی پیتەکان

سیفەتی پیتەکان: ئەو نیشانەو تایبەتمەندیانەیە کەبەهۆیەوە پیتەکانی پێدەناسرێتەوەو لەیەکتری جیادەکرێنەوە.

**سوودی زانینی سیفەتەکان:**

١- جیاکردنەوەی ئەو پیتانەی جێدەنگیان هاوبەشن، بۆ نموونە: هەرسێ پیتی (ث، ذ، ظ) کە جێدەنگیان پێشەوەی زمانو بەشی خوارەوەی بڕەڕەکانی سەرەوە.

٢- چاك دەربڕینی پیتەکان .

٣- ناسینی پیتە بەهێزو لاوازەکان.

**جۆری سیفەتەکان:**

یەکەم- سیفەتە هەمیشەییەکان (الصفات اللازمة): ئەو سیفەتانەن کەبەشێکن لەپیتەکەو هەرگیز لێی جیانابنەوە، ژمارەیان لەسەر ڕای بەناوبانگی زانایان حەڤدە سیفەتە.

دووەم- سیفەتە کاتیەکان (الصفات العارضة): ئەو سیفەتانەن کەتەواوکەری پیتەکەنو لەهەندێ دۆخی دیاریکراودا تووشیدەبنو لەهەندێ دۆخیشدا لەبەر هۆکارێ لەهۆکارەکان لێی جیادەبنەوە، لەکاتی جیابوونەوەیاندا کاریگەرییان لەسەر خودی پیتەکە نییە، وەك: شاردنەوە (الإخفاء) و تێهەڵکێش (الإدغام) و گەورەکردن (التفخیم) و هتد ... [٧٥].

[٧٥] بڕوانە: هداية القاري إلى تجويد كلام الباري للمرصفي ل٤٤.

## یەکەم: سیفەتە هەمیشەییەکان (الصفات اللازمة)

ئەم سیفەتانەش دەبن بەدوو بەشەوە:

١- سیفەتە دژەکان (الصفات المتضادّة):

پێنج کۆمەڵەن‌و لەهەر کۆمەڵەیەکدا دوو سیفەتی دژبەیەك هەیە، ئەگەر یەکێك لەو دوو سیفەتە لەپیتێکدا بەدیکرا ئیدی ئەوی تریانی تێدا بەدیناکرێت. بەڵام پێویستە هەموو پیتێك یەکێکیانی تێدا بەدیبکرێت. پێنج کۆمەڵەکەش ئەمانەن:

(١) چپەو ئاشکرا (الهمس والجهر):

چپە (الهمس) لەزمانەوانیدا چپەیە. لەزاراوەشدا بیستن بەئەسپایی بەهۆی کردنەوەی دەنگە ژێیەکان‌و نەلەرزینیان‌و دەرچوونی زۆرێك لەهەوای هەناسەیە. پیتەکانی: (١٠) پیتن‌و ئینولجەزەریش لەم وتەیەدا کۆی کردوونەتەوە: (فحثه شخص سکت)[٧٦]

ئەم پیتانە لەناو خۆیاندا وەکیەك نین، بەڵکو هەندێکیان لەهەندێکی تریان لاوازترن، بۆ نموونە پیتی (ص) لەوانی تر بەهێزترە، چونکە سیفەتی جووتکردن (الإطباق)و بەرزیی (الإستعلاء)و فیکە (الصفیر)ی هەیە کە ئەمانە سیفەتی بەهێزن، پاشان پیتی (خ) دێت، چونکە سیفەتی بەرزیی (الإستعلاء)ی هەیە، هەروەها پیتی (ك، ت) جگە لە(ص، خ) لەپیتەکانی تر بەهێزترن، لەهەموویان لاوازتر پیتی (ه)یە، هەر بۆیە ئەم پیتەیان بە درێژکردنەوەی گەیاندن (مد الصلة) بەهێز کردووە.[٧٧] پاشانیش (ف)و (ح)و (ث).

ئاشکرا (الجهر)یش لەزمانەوانیدا دەنگ بەرزییە. لەزاراوەشدا بیستنی بەڕوونی بەهۆی داخستنی دەنگە ژێیەکان‌و لەرینەوەیان و ڕێنەکردنی زۆرێك لەهەوای هەناسە.

پیتەکانی: (١٩) پیتەکەی تری زمانی عەرەبی دەگرێتەوە کەلەم وتەیەدا

---

[٧٦] واتە: بێدەنگ بوو، کەسێك هانیدا بۆ قسەکردن.

لە بنچینەدا (سکت فحثه شخص) لەبەر ناچاری شیعری (الضرورة الشعرية) پاش و پێش خراوە.

(وانەکانی د.أیمن سوید)

[٧٧] نهاية القول المفيد في فن التجويد ل ٦٩.

کۆکراونەتەوە (عَظمَ وَزْنُ قَارِیء ذِي غَضٍّ جِدٍّ طَلَب)[٧٨] ئەم پیتانەش لەڕووی بەهێزیەوە جیاوازن، پیتی (ط) لەهەمویان بەهێزترە پاشانیش (د).

ئیبنولجەزەریش دەڵێت:

صِفَاتُهَا جَهْرٌ وَ رِخْوٌ مُسْتَفِــــلْ      مُنْفَتِحٌ مُصْمَتَةٌ وَالضِّدَّ قُــــلْ.

مَهْمُوسُهَا: (فَحَثَّهُ شَخْصٌ سَكَتْ)      ..............................







---

[٧٨] واتە: پلەو پایەی بەرزە ئەو قورئان خوێنەی چاوی لەحەڕام دەپارێزێت و کۆشش دەکات بۆ وەدەست هێنانی زانست.

(٢) توندی و نەرمی (الشدّة والرّخاوة):

توندی (الشدّة) لەزمانەوانیدا ڕەق وبەهێزە. لەزاراوەشدا گیران یاخود قەتیسبوونی دەنگە لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا لەبەر تەواوی پشتبەستن بەجێدەنگەکەیەوە (یان لەبەر داخستنی جێدەنگەکەی).

ئەم ڕێنەکردنەش کاتێك دەردەکەوێت پیتەکە زەنندداربێت.

پیتەکانی: (٨) پیتن لەم ڕستەیەدا ئیبنولجەزەری کۆیکردوونەتەوە (أَجِدْ قَطٍ بَكَتْ).[79] ئەم پیتانەش لەڕووی پتەوی وبەهێزیەوە لەیەکتر جیاوازن، ئەگەر لەگەڵ سیفەتی توندیی (الشدة)دا سیفەتی ئاشکرا (الجهر)و بەرزیی (الإستعلاء)و جووتکردن (الإطباق) یان هەبوو ئەوە ئەوپەڕی بەهێزییە، وەك پیتی (ط).

ئیبنولجەزەریش سەبارەت بەم سیفەتە دەڵێت:

........................ شَدِيْدُهَا لَفْظُ (أَجِدْ قَطٍ بَكَتْ)




[79] واتە: گوێم لێیە (قط) دەگری. (قط)ناوی ئافرەتێکە.

نەرمی (الرَّخاوة)ش لەزمانەوانیدا نەرم‌و نیانییە.

لەزاراوەشدا ڕێکردنی دەنگە لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا.

پیتەکانی: (١٦) پیتن: (ث، ح، خ، ذ، ز، س، ش، ص، ض، ظ، غ، ف، هـ، و، ي، ا).[٨٠]




[٨٠] هەندێ لەزانایان بەشیعر هۆنیویانەتەوە:

رخو من الحروف ست وعشرْ حاء وخــاء وذال زاي ذا اشتهرْ

ثاء وسين ثم شيـــــن وألفْ صاد وضاد ثــم ظاء واو عــرفْ

والغين ثم الفاء ثمّ الهـــــاءُ وقد أتى في ختمــهنَّ اليــــاءُ

هەروەها لەنێوان توندی (الشدّة)و نەرمی (الرّخاوة)شدا سیفەتی مامناوەند (التوسط) یاخود نێوانیی (البينيّة) هەیە، کەدەنگ تیایاندا بەتەواوی ناگیرێتو بەتەواویش رێناکات.

پیتەکانی: (٥) پیتن، ئیبنولجەزەریش لەڕستەی (لِنْ عُمَر)[٨١]دا کۆیکردوونەتەوە.

ئیبنولجەزەریش دەڵێت:

وَبَيْنَ رِخْوٍ وَالشَّدِيدِ ( لِنْ عُمَرْ)   ..........................




[٨١] واتە: نەرم ونیان و لەسەرخۆبە ئەی (عمر).

**سوود: پیتەکانی زمانی عەرەبی لەڕووی ڕێکردنی دەنگ‌و هەناسەوە دەبن بەپێنج کۆمەڵەوە[٨٢] :**

**١-توندو و ئاشکرا (شدیدة مجهورة): (٦) پیتن ( قطب جد+الهمزة)**

**لەم (٦) پیتەدا دەنگ‌و هەناسە بەهیچ شێوەیەك ڕێناکەن‌و بواری هاتنەدەرەوەیان نییە، لەکاتی دەربڕینندا قورساییەك دروستدەکەن، بۆیە عەرەب لەرینەوە (القلقلة)یان بۆ پیتەکانی (قطب جد)و ئاسانکردن (التسهیل)یشیان بۆ پیتی هەمزە داناوە.**

**٢- توندو ئەسپایی (شدیدة مهموسة) هەردوو پیتی (ك، ت):**

**ئەم دوو پیتە لەسەرەتای دەربڕینیاندا دەنگ لەگەڵیاندا دەرناچێت، بەڵام لەکۆتایی دەربڕینیادا هەناسە دەردەچێت. هەربۆیە هەندێ لەزانایان وتویانە پیتی (ك، ت) لەسەرەتاوە بەهێز (شدید)ن لەکۆتاییشدا ئەسپایی (مهموس)ن.**




**ڕێکردنی هەناسە پاش گیرانی دەنگ لەمەخرەجدا لەکاتی دەربڕینی (الشدید المهموس)دا، ئەویش لەهەردوو پیتی (ك، ت)دا.**

---

[٨٢] **بڕوانە: تیسیر الرحمن في تجوید القرآن ل ٧٩ دواتر.**

**٣- ئاشكراو نەرم (مجهورة رِخْوة): بریتیە لە [ض، ظ، ذ، غ، ز، (و، ي: ئاسان - اللین)، پیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ)].**

**ئەم پیتانە دەنگ لەگەڵیان ڕێدەکاتو هەناسە لەگەڵیان دەگیرێت.**

**٤- چپەو ونەرم (مهموسة رِخوة): (فحثَّهُ شخصٌ س) (ف، ح، ث، ه، ش، خ، ص، س)**

**ئەم پیتانە بەهۆی لاوازی پشتبەستنیان بەجێدەنگەکانیان دەنگ بەتەواوی لەگەڵیاندا ڕێدەکات، بەهۆی کردنەوەی دەنگەژێیەکان هەناسەش بەتەواوی لەگەڵیاندا ڕێدەکات. بۆ نموونە: (أَسْ)، (أَخْ)، (أَشْ).**

**٥- مامناوەندو ئاشکرا (متوسطة مجهورة) (لِنْ عمر):**

**ئەم پیتانەش هەناسە لەگەڵیاندا ڕێناکات، بەڵام دەنگ بەشێوەیەکی مامناوەند لەگەڵیاندا ڕێدەکات. بۆ نموونە: (أَلْ)، (أَنْ)، (أَرْ)**

**تێبینی:**

**١- هەموو پیتەکانی چپە (الهمس) سیفەتی نەرمی (الرِخاوة)یان تێدایە جگە لە (ك، ت) کە دوو پیتی توند (شدید)ن.**

**٢- هەمو پیتە توندەکان (الشدیدة) سیفەتی ئاشکرایان (الجهر) تێدایە جگە لە (ك، ت) کە دوو پیتی چپە (الهمس)ن.**

**٣- ماوەی پیتە نەرمەکان (الرِّخاوة) درێژترن لەماوەی پیتە نێوانیەکان (البینیّة)و، ماوەی پیتە نێوانیەکان (البینیّة)ش درێژترن لەماوەی پیتە توندەکان (الشدة).**[٨٣]

---

[٨٣] **أطلس التجوید ل ٦١.**

(٣) بەرزی و نزمی (الإستعلاءُ والإستفال):

* بەرزی (الإستعلاء) لەزمانەوانیدا: بەرزییە، لەزاراوەشدا: دوورترینی زمان (أقصى اللسان) بەرەو مەلاشوو لەکاتی دەربڕینی پیتەکانیدا بەرزدەکرێتەوە. کەواتە دوورترینی زمان لەگەڵ هەموو پیتەکانیدا بەرزدەبێتەوە، هەرچەندە جێدەنگی هەندێك لەپیتەکانی پەیوەندیان بەزمانەوە نییە وەك: (ع، غ).[٨٤]

لەم ڕوانگەیەوە هەندێك لەزانایان بەمجۆرە پێناسەی دەکەن: بەرزبوونەوەی ئاڕاستەی دەنگ بەرەو مەلاشوو.[٨٥]

ژمارەی پیتەکانی (٧) پیتن و ئیبنولجەزەری لەپێشەکیەکەیدا دەڵێت:

........................... وَسَبْعُ عُلْوٍ (خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ) حَصَرْ.[٨٦]

بەرزترینی پیتە بەرزەکان (الإستعلاء) پیتی (ق)و، نزمترینیان پیتی (خ)یە.

پلەبەندی قەڵەوکردنی پیتە بەرزەکان (الإستعلاء)[٨٧]:

سەبارەت بەم پلەبەندیە زانایان دوو بۆچوونیان هەیە:

بۆچوونی یەکەم: بۆچوونی (ابن الطحان الأندلسي)یە کە دەڵێت هەر یەکێك لەم پیتانە سێ پلەیان هەیە:

پلەی یەکەم: قەڵەوترینیانە، ئەگەر سەر (فتحة) یان هەبوو، وەك:

﴿طَالُوت﴾، ﴿ٱلضَّآلُّونَ﴾، ﴿صَاحِبُكُم﴾، ﴿ٱلظَّٰلِمُون﴾، ﴿قَال﴾، ﴿خَلَا﴾، ﴿ظَلَم﴾.

---

[٨٤] بڕوانە: نهاية القول المفيدفي فن التجويد: ل:٧٥، المنير في أحكام التجويد ل: ٧٣.

[٨٥] بڕوانە: التجويد المصور ل: ١٥٤، تيسير علم التجويد ل: ٢٣٦-٣٢٧.

[٨٦] ڕستەی (خُصَّ ضَغْطٍ قِظْ) لەڕووی واتاوە دوو ئامۆژگاری لەخۆ دەگرێت:

یەکەم: لەگەرمای هاویندا بەخانویەکی لەقامیش دروستکرای تەسك و بچووکدا قەناعەت بکە.

( قِظ): بمێنەرەوە، ( خُصَّ): خانووی لەقامیش دروستکراو.

دووەم: بێدار بەرەوە قەبر گۆڕشانی هەیە.

( قِظ): بێدار بەرەوە، (ضَغط) گۆڕشان.

[٨٧] بڕوانە: النشر في القراءات العشر لابن الجزري (١/٢٤٦)، فتح رب البرية ل ١١، الجامع الكبير في فن التجويد: (٢/١٦٩- ١٧١).

پلەی دووەم: ئەگەر بۆر (ضمّة) یان هەبوو.

وەك: ﴿طُوبَىٰ﴾، ﴿يَقُولُ﴾، ﴿لَا تَخُونُواْ﴾

پلەی سێیەم: ئەگەر ژێر (كسرة) یان هەبوو.

وەك: ﴿طِبْتُمْ﴾، ﴿قِيلَ﴾، ﴿خِزْىِ﴾

بەڵام ئەگەر زەنەی (سكون) هەبوو سەیری پیتی پێشەوەی دەكرێت، ئەگەر:

- پیتی پێشەوەی سەری (فتحة) هەبوو، ئەوە لەپلەی یەكەمدایە، وەك:

﴿أَيَطْمَعُ﴾،﴿أَضْغَٰثُ﴾،﴿أَصْلَبَنَّكُمْ﴾،﴿أَظْلَمَ﴾،﴿يَغْلِبْ﴾،﴿مَقْرَبَةٍ﴾،﴿أَخْرَجَكُم﴾.

- پیتی پێشەوەی بۆری (ضمة) هەبوو لەپلەی دووەمدایە.

وەك: ﴿لِيُطْفِـُٔواْ﴾، ﴿يُصْرَفُ﴾، ﴿مُّظْلِمُونَ﴾، ﴿وَلَا يُقْبَلُ﴾، ﴿يُغْفَرُ﴾

- پیتی پێشەوەی ژێری (كسرة) هەبوو لەپلەی سێیەمدایە.

وەك: ﴿إِطْعَامُ﴾، ﴿ٱضْرِب﴾، ﴿أَفْرِغْ﴾، ﴿شِقْوَتُنَا﴾، ﴿إِخْرَاجًا﴾

بۆچوونی دووەم: هەر یەكێك لەم پیتانە پێنج پلەیان هەیە، ئەم بۆچوونەش پەسەندكراوە لەلای ئیبنولجەزەریەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێت:

پلەی یەكەم: قەڵەوترینیانە ، ئەگەر سەر (فتحة) یان هەبێ و بەدوایاندا پیتی ئەلیف هاتبێ، وەك:

﴿طَابَ﴾، ﴿ضَاقَتْ﴾، ﴿صَابِرًا﴾، ﴿يُظَاهِرُونَ﴾، ﴿يُقَاتِلُونَ﴾، ﴿غَآئِبِينَ﴾، ﴿خَآئِبِينَ﴾

پلەی دووەم: ئەگەر سەر (فتحة) یا﴿ن ببێ و بەدوایاندا پیتی ئەلیف نەهاتبێ.

وەك: ﴿طَبَعَ﴾، ﴿ضَرَبَ﴾، ﴿صَدَقَ﴾، ﴿ظَلَّ﴾، ﴿قَتَلَ﴾، ﴿غَفَرَ﴾،﴿خَلَقَ﴾

پلەی سێ یەم: ئەگەر بۆر (ضمة)یان هەبێت، وەك:

﴿فَطُبِعَ﴾، ﴿صُرِفَتْ﴾، ﴿ضُرِبَتْ﴾، ﴿يَظُنُّونَ﴾، ﴿قُتِلَ﴾، ﴿غُلِبَتِ﴾، ﴿خُلِقَتْ﴾

**پلەی چوارەم: ئەگەر زەنندەدار (ساكن) بوون .**

**وەك:** ﴿يَطْبَع﴾، ﴿يَضْرِب ﴾، ﴿أَصْبَرَهُم﴾، ﴿يَظْلِم﴾، ﴿يَقْتُل ﴾، ﴿يَغْلِب﴾، ﴿يَخْلُق﴾

**پلەی پێنجەم: ئەگەر ژێر (كسرة) یان هەبوو.**

**وەك:** ﴿طِبَاقًا﴾، ﴿ضِرَارًا﴾، ﴿صِرَاط﴾، ﴿ظِلا﴾، ﴿قِتَالاً﴾، ﴿غِشَاوَة﴾، ﴿خِفَافًا ﴾

**(العلاّمة المُتَولِّي)ش بەهۆنراوە باسی لەهەردوو بۆچوونەكە كردووە:[88]**

**بۆچوونی یەكەم:**

ثُمَّ الْمُفَخَّمَاتُ عَنْهُمْ آتِيَــةْ      عَلَى مَرَاتِبٍ ثَلاَثٍ ، وَهِيَـــهْ:
مَفْتُوحُهَا،مَضْمُومُهَا،مَكْسُورُهَا      وَتَابعٌ مَا قَبْلَهُ سَاكِنُــــــــهَا
فَمَا أَتَى مِنْ قَبْلِهِ مِنْ حَرَكَهْ      فَافْرِضْهُ مُشْكَلاً بِتِلْكَ الْحَرَكَهْ.

**بۆچوونی دووەم:**

وَقِيلَ:بَلْ مَفْتُوحُهَا مَعَ الأَلِفْ      وَبَعْدَهُ الْمَفْتُوحُ مِنْ دُونِ أَلِفْ
مَضْمُومُهَا،سَاكِنُهَا، مَكْسُورُهَا      فَهَذِهِ خَمْسٌ أَتَاكَ ذِكْــــرُهَا
فَهْيَ وَإِنْ تَكُنْ بِأَدْنَى مَنْزِلَهْ      فَخِيمَةٌ قَطْعاً مِنَ الْمُسْتَفِلَــهْ
فَلاَ يُقَالُ إِنَّهَا رَقِيــــــقَهْ      كَضِدِّهَا، تِلْكَ هِيَ الْحَقِيــقَهْ.




**شێوەی دەم لەكاتی دەربڕینی پیتێكی قەڵەوی بزواو**

[88] فتح رب البرية ل ١٢.

تێبینی:

١- ئەگەر پیتی (خ)ی زەنندار پێشەوەی ژێری (کسرة) هەبوو، بەڵام بەدوایدا پیتی (ر)ی گەورە هاتبوو، دەبێت پیتی (خ) بەقەڵەوتر بخوێنرێتەوە لەبەر پیتی (ر).[89] واتە: لەپلەی چوارەمی پلەبەندی قەڵەوکردنی پیتە بەرزەکان (الإستعلاء)ەوە دەچێتە پلەی دووەم.[90] وەك: ﴿وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾ (نوح:١٨) ﴿وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ﴾ (يوسف:٣١)

(العلامة المتولي) دەڵێت:[91]

وخاءُ إخراج بتفخيمٍ أتت          من أجل راءٍ بعدها إذْ فُخِّمتْ.

*نزمی (الإستفال) لەزمانەوانیدا: نزمییە، لەزاراوەشدا: نزمبوونەوەو دابەزینی زمان لەکاتی دەربڕینی پیتەکانیدا. یاخود نزمبوونەوەی ئاڕاستەی دەنگ لەکاتی دەربڕینی پیتەکانیدا.

ژمارەی پیتەکانی: (٢٢) پیتەکەی تری زمانی عەرەبین:

(ء، ب، ت، ث، ج، ح، د، ذ، ر، ز، س، ش، ع، ف، ك، ل، م، ن، هـ، و، ي، ا).

هەندێك لەزانایان لەم ڕستەیەدا کۆیانکردۆتەوە: (ثَبَتَ عِزّ مَنْ يُجَوّدْ حَرْفَهُ إذ سَلَّ شَكا)[92]




[89] بڕوانە: الجامع الكبير في فن التجويد (١٧٣/٢).
[90] تيسير الرحمن ل ١٤٤.
[91] هداية القاري إلى تجويد كلام الباري ل ٦٠.
[92] بڕوانە: إحكام الأحكام في تجويد القرآن ل٣٩.

(٤)  جووتكردن و والآكردن (الإطباق والإنفتاح):

* جووتكردن (الإطباق) لەزمانەوانیدا: پێكەوەنانە، لەزاراوەشدا: پێكەوەنانی بەشێكی زمان یان زۆرینەی بەئاسمانەی دەم (مەلأشوو)ەوە، یان نزیكبونەوە لێی بەشێوەیەك لەكاتی دەربڕیندا دەنگ لەنێوانیاندا پەنگبخواتەوە.[٩٣] پیتەكانی: (٤) پیتن (ص، ض، ط، ظ ).

ئیبنولجەزەری دەڵێت:

وَصَادُ ضَادٌ طَاءُ ظَاءٌ مُطْبَقَهْ          ......................... .

تێبینی:

١- پیتی (ط) بەهێزترینیانەو (ظ)یش لاوازترینەو (ض، ص)یش مامناوەندن.

٢- سیفەتی جووتكردن (الإطباق) تایبەترە لەسیفەتی بەرزیی (الإستعلاء)، واتە هەموو پیتەكانی جووتكردن (الإطباق) سیفەتی بەرزیی (الإستعلاء)یان تێدایە، بەلأم مەرج نییە هەموو پیتێكی بەرز (الإستعلاء) سیفەتی جووتكردن (الإطباق)ی تێدا بێت.[٩٤]

---

[٩٣] بڕوانە: تیسیر علم التجوید ل: ٢٣٩، المنیر ل: ٧٤،

[٩٤] بڕوانە: نهایة القول المفید في فن التجوید: محمد مكي نصر ل ٧٧.

* والآكردن (الإنفتاح) لەزمانەوانیدا: کرانەوەو جیابوونەوە، لەزاراوەشدا: دوورکەوتنەوەی زمان یان زۆرینەی لەئاسمانەی دەم (مەلاشوو) لەکاتی دەربڕیندا. پیتەکانی: (٢٥) پیتەکەی ترن، لەم وتەیەدا کۆکراونەتەوە:
(من أخذ وَجد سعة فزكا حق له شرب غيث) [٩٥]




سوود: بەهۆی لێکدانەوەی ئەم چوار سیفەتە بەرزی و نزمیی (الاستعلاءُ والإستفال)و جووتکردن و والآکردن (الإطباق والإنفتاح) دوو خاڵمان بۆ ڕووندەبێتەوە:

١- پیتە بەرزەکان (الإستعلاء) دەبن بەدوو بەشەوە:

أ- پیتی بەرزی جووت (حروف مستعلية مطبقة): (٤) پیتن (ص، ض، ط، ظ)

گەر سەرنج بدەین بۆمان ڕووندەبێتەوە کەئەم پیتانە قەڵەوترن لەپیتە بەرزە والآکان (مستعلية منفتحة)کان، بۆ نموونە سیفەتە بەهێزەکانی پیتی (ق) زیاترە لەسیفەتە بەهێزەکانی پیتی (ص)، بەلاَم پیتی (ص) قەڵەوترە لەپیتی (ق) ئەویش لەبەر بوونی سیفەتی جووتکردن (الإطباق) لەپیتی دووەمدا.

---

[٩٥] واتە: هەرکەسێك زەکاتی سامانەکەی دەرکات، مافە بەسەر پەروەردگارەوە بەزەیی خۆی بەسەردا بڕژێنێت. هەمان سەرچاوە ل ٧٧.

ب- پیتی بەرزی والآ (حروف مستعلية منفتحة): (٣) پیتن (ق، غ، خ)

لەکاتی دەربڕینی ئەم سێ پیتەدا کۆتایی زمان بەرەو مەڵاشوو بەرزدەبێتەوە بێئەوەی پێوەی بنووسێ، بۆیە قەڵەوییان کەمترە لەپیتە بەرزە والآکان (مستعلية مطبقة)کان.

کەوابوو پێویستە لەکاتی خوێندنەوەدا جیاوازبن وەك: ﴿ٱلطَّآمَّةُ﴾و ﴿ٱلْخَـٰلِدُونَ﴾.

٢- کاریگەری ژێر (کسرة) لەسەر پیتە بەرزە والآکان (مستعلية منفتحة)کان زیاترە لەسەر پیتە بەرزە والآکان (مستعلية مطبقة)کان، چونکە یەکەمیان کاریگەری ژێر (کسرة)و والآکردن (إنفتاح)ی لەسەرە، بەڵام دووەمیان تەنها لەژێر کاریگەری ژێر (کسرة) دایە، بۆنموونە پیتی (ظ)ی ژێردار (مكسور) لە وشەی ﴿ظِلٍّ﴾ قەڵەوترە لەپیتی (غ)ی ژێردار لەوشەی ﴿غِلٍّ﴾دا.[٩٦]

[٩٦] بڕوانە: تيسير الرحمن في تجويد القرآن ل ٨٦-٨٧.

(٥) الإذلاق والإصمات:

*(الإذلاق) لەزمانەوانیدا: تیژی، قەراخ، ڕەوانبێژی، خێراییە. لەزاراوەشدا: دەربڕینی پیتەکانی بەخێرایی‌و بەئاسانی، لەبەر دەرچوونیان لەپێشەوەی زمان یا هەردوو لێوەوە.

ئیبنولجەزەریش لەم ڕستەیەدا کۆیکردوونەتەوە:

........................ وَ (فِرَّ مِنْ لُبِّ)[٩٧] الحُرُوفِ المُذْلَقَهْ

واتە: لەدەست ژێرەکە ڕاکە.

(ل، ن، ر) جێدەنگیان پێشەوەی زمانە، (ف، م، ب) جێدەنگیان هەردوولێوە.

*(الإصمات) لەزمانەوانیدا: ڕێگرتنە. لەزاراوەشدا: دەربڕینی پیتەکانە بەقورسی، هەر بۆیە ڕێگریکراوە لەکۆبوونەوەی پیتەکانی بەتەنها- بەبێ پیتەکانی (إذلاق)- لەوشەی چوار پیتی‌و پێنج پیتی بنچینەیی (أصل)یدا. پیتەکانی: (٢٣) پیتەکەی ترن و لەم وتەیەدا کۆکراونەتەوە: (جز غش ساخط صيد ثقة إذ وعظه يحضك).

واتە: لەفێڵبازو حەق نەویست خۆت بەدوور بگرە، بەشوێنی مرۆڤی خاوەن متمانەدا بکەڕێ، چونکە ئامۆژگاریەکانی هانت دەدەن بۆ چاکەکردن.

هەر بۆیە گوتویانە هەریەك لەوشەی (عَسجد: ئاڵتوون )و (عَسَطُوس: درەختی خەیزەڕان)، ئەعجەمین (هێنراوەتە ناو زمانی عەرەبیەوە)، چونکە لەسێ پیتی بنچینەیی (أصلي) زیاتر پێکهاتوون و پیتی (إذلاق)یشیان تێدا نییە.

تێبینی: خوێنەری بەڕێز، ئەم دوو سیفەتە (الإذلاق والإصمات) بابەتێکی زمانەوانی (لغوي)ن‌وهیچ پەیوەندییان بەزانستی تەجویدەوە نییە، ڕەنگە هۆی باسکردنیشیان ئەوە بووبێت تاوەکو ژمارەی سیفەتەکان بگەنە (١٧) سیفەت‌و لەگەڵ ژمارەی جێدەنگەکان یەکسان بن، بۆیە زۆر لەتوێژەران ئەم دوو سیفەتەیان فەرامۆشکردووە.[٩٨]

---

[٩٧] واتە: نەزانەکە لەدەست مرۆڤە ژیرەکە هەڵهات.

[٩٨] بڕوانە: فتح رب البريّة شرح المقدمة الجزرية ل ١٣، أحكام قراءة القرآن الكريم للحصري ل ٩٧، المنير ل: ٧٧.

٢- سیفەتە بێ دژەکان:

یەکەم: فیکە (الصَّفير)

لەزمانەوانیدا: فیکەی، دەنگی تیژ، دەنگی باڵندەیە.

لەزاراوەشدا: دەنگێکە لەدەنگی باڵندە دەچێت، لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا لەنێوان بڕەڕو سەری زمانەوە دێتەدەرێ. پیتەکانی: (٣) پیتن (ص، ز، س) ئیبنولجەزەریش لەنیوە دێڕێکدا کۆیکردوونەتەوە:

صَفِيرُهَا صَادٌ وَزَايٌ سِينُ .........................




دەنگی پیتی (ص) لەدەنگی (وَز)[٩٩] دەچێت، دەنگی پیتی (ز) لەدەنگی هەنگ دەچێت، دەنگی پیتی (س) لەدەنگی کوللە دەچێت.

بەهێزترینی ئەم پیتانەش پیتی (ص)ە لەبەرئەوەی سیفەتی بەرزیی (الإستعلاء)و جووتکردن (الإطباق)ی تێدایە، پاشانیش (ز) کە سیفەتی ئاشکرا (الجَهر)ی تێدایە، پیتی (س)یش لاوازترینیانە کە سیفەتی چپە (الهمس)و نەرمی (الرِّخاوة)ی تێیدا، بۆیە پێویستە سیفەتی فیکە (الصفیر)ی پیتی (س) بەهێزتربێت لەپیتی (ز)، چونکە

[٩٩] باڵندەیەکە لەقاز دەچێت، بەڵام هەڵدەفڕێت.

**دوو سیفەتی لاوازی تێدایە، هەروەها دەبێت سیفەتی فیکە (صفیر)ی پیتی (ز)یش بەهێزتربێت لەپیتی (ص)، چونکە ئەمیش سیفەتێکی لاوازی تێدایە.**

**پلەکانی فیکە (الصَّفیر):**

**١- بەهێز: ئەگەر (شدّة)داربوو: (السَّامريّ)، (الزّكاة)، (الصَّلاة).**

**٢- مامناوەند: ئەگەر زەننەدار بوو (يُوَسْوِسُ)، (بالأزْلام)، (واصْطبر).**

**٣- لاواز: ئەگەر بزواو (متحرك) بوو.**[100]

**دووەم: لەرینەوە (القلقلة):**

**لەزمانەوانیدا: لەرینەوە، جووڵەو بزوتنە.**

**لەزاراوەشدا دەرخستنی دەنگێکی بەهێز لەکاتی زەننەداری پیتەکانیدایە. پیتەکانی: (٥) پیتن، ئیبنولجەزەری لەڕستەیەکدا کۆیکردوونەتەوە:**

.................... قَلْقَلَةٌ (قُطْبُ جَدٍّ).......

**واتە: جەمسەری گەورەیی.**

**ئەم پێنج پیتە سیفەتی توندی (الشِدّة)و ئاشکرا (الجَهر)یان تێدایەو نابێت لەکاتی دەربڕیندا دەنگ‌و هەناسە لەگەڵیاندا بێتەدەر، لەبەرئەوە پێویستییان بە لەرینەوە (القلقلة) دەبێت تاوەکو دەنگی پیتەکان دەرکەون .**

**ڕیزبەندی پیتەکانی لەرینەوە (القلقلة) لەڕووی بەهێزیو ڕوونیەوە:**

**لەڕووی بەهێزیەوە پیتی (ط) بەهێزترینیانە، پیتی (ق)یش لەپلەی دووەمدایە، پاشان هەرسێ پیتەکەی تر (ب، د، ج) لەپلەی سێیەمدا دێن. لەڕووی ڕوونیشەوە پیتی (ق) ڕوونترینیانە، پاشان پیتەکانی تر.**

---

[100] **الجامع الكبير في علم التجويد ل (٢/ ١٠٣)**

**بەشەکانی لەرینەوە (القلقلة):**

**١- لەرینەوە (القلقلة)ی بچووك: ئەگەر پیتەکە زەننەدار (ساکن) بێت، قورئان خوێن لەسەری نەوەستێت.**

**وەك:** ﴿يَقۡدِرَ﴾، ﴿أَفَتَطۡمَعُونَ﴾، ﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا﴾، ﴿تَجۡهَلُونَ﴾، ﴿يُدۡعَوۡنَ﴾

**٢- لەرینەوە (القلقلة)ی گەورە: ئەگەر پیتەکە زەننەدارو لەحاڵەتی وەستان (وقف)دا بێتو (شَدّة)دار نەبێت. وەك:** ﴿وَاقٖ﴾، ﴿مُحِيطٌ﴾، ﴿ٱلۡعَذَابِ﴾، ﴿بَهِيجٖ﴾، ﴿بَعِيدٖ﴾

**٣- لەرینەوە (القلقلة)ی گەورەتر: ئەگەر پیتەکە (شَدّة)دارو لەکۆتایی وشەداو لەحاڵەتی وەستان (وقف)دا بێت. وەکو:** ﴿ٱلۡحَجِّ﴾، ﴿ٱلۡحَقُّ﴾، ﴿وَتَبَّ﴾، ﴿أَشَدُّ﴾.[١٠١]

**ئینولجەزەری دەڵێت:**

وَبَيِّنَنْ مُقَلْقَلاً إنْ سَكَنَا        وَإِنْ يَكُنْ فِي الْوَقْفِ كَانَ أَبْيَنَ




١٠١ سەرچاوەی پێشوو (١٢٢/٢).

چۆنێتی دەربڕینی لەرینەوە (القلقلة):

لەرینەوە (القلقلة): بریتیە لەدەنگدانەوەی پیتەکە لەجێدەنگەکەیداو نزیك لەهیچ جوڵەیەکەوە نییە، واتە: (فتحة)و (ضمّة)و (کسرة).

ئەمەش ڕای پەسەندکراوی زۆرینەی هەرە زۆری زانایانە،[102] ئێمەش لەمامۆستاکەمانەوە هەر بەو شێوەیە وەرمانگرتووە.

---

[102] بڕوانە: حق التلاوة، لا: ٢٢٤، التجويد المصور، لا: ١٥٨ ، تيسير علم التجويد، لا: ٢٤٥، تيسير الرحمن، لا: ٩٦- ١٠٢.

سەبارەت بەچۆنێتی دەربڕینی لەرینەوە (القلقلة) چەند بۆچونێکی تریش هەن گرنگترینیان ئەمانەن:

١- پیتەکانی لەرینەوە

٢- لەرینەوە (القلقلة) بەشێوەیەك دەربڕێن کەنزیك بکرێنەوە لەجوڵەی پیتی پێش خۆیان، واتە ئەگەر پیتی پێش خۆیان سەر (فتحة)ی هەبوو ئەوا لەکاتی دەربڕیندا نزیکدەکرێنەوە لە(فتحة) ئەگەر (ضمّة)شیان لەپێشەوە بوو لەکاتی دەربڕیندا نزیکدەکرێنەوە لە(ضمّة)و، ئەگەر (کسرة)شیان هەبوو لەکاتی دەربڕیندا نزیکدەکرێنەوە لە(کسرة). نموونە: ﴿يَطْبَع﴾، ﴿تُجْزَوْن﴾، ﴿قِبْلَة﴾.

ئەمەش پەسەندکراوە لەلای هەندێك لەزانایان لەوانە (السمنّودي) کە لە(لآلیء البيان)دا دەڵێت:

قَلْقَلَةٌ (قُطْبُ جَدٍ) وَقُرِّبَتْ       لِلفَتْحِ وَالأَرْجَحُ مَا قَبْلُ اقْتَفَتْ.

بڕوانە: لآليء البيان ل: ٤، المنير، لا: ٨٠، هداية القاري، لا: ٤٩-٥٠.

٣- لە هەموو کاتێکدا لەکاتی دەربڕیندا نزیك دەکرێنەوە لە(فتحة)، ئەمەش ڕای هەندێکیانە، لەوانە شێخ ( محمود خليل الحصري)، بەلاّم سەیر لەوەدایە شێخ ئەم ڕایە دەداتە پاڵ زۆرینەی زانایان!

بڕوانە: أحكام قراءة القرآن الكريم للحصري ل: ١٠١- ١٠٢. هەندێکیان بەهۆنراوە باسیان لەم ڕایە کردووە:

وقَلْقَلَةً قَرّبْ إلى الفتحِ مُطْلَقًا       ولا تُتْبِعَنْها بالذي قَبْلُ تُقْبَلا.

**سێیەم: ئاسان (اللِّين):**

**لەزمانەوانیدا: ئاسانییە. لەزاراوەشدا بەئاسانی دەرچوونی پیتە لەجێدەنگەکەوە.**

**پیتەکانی: دوو پیتن (و، ي) کاتێك زەنندداربن و پێشەوەیان سەر (فتحة)ی هەبێت [واتە پیتی درێژکردنەوە (المدّ) نەبن]. نموونە: ﴿خَوۡف﴾، ﴿ٱلۡبَيۡت﴾، ﴿شَيۡءٍ﴾**

**پێشەوا ئیبنولجەزەریش دەڵێت:**

...................... ..............واللينُ

واوٌ وياءُ سُكِّنَا وانفَتَحَا قبلَهُما.............

**تێبینی: سیفەتی (لين) لاوازترە لە درێژکردنەوە (المدّ)، هەر بۆیە لەگەڵ پیتی ئەلیفدا هەرگیز باسناکرێت، هەرچەندە پیتی ئەلیف پیتی درێژکردنەوە (المدّ)و ئاسان (اللين)یشە، چونکە پێناسەی ئاسان (اللين)ی تێدا بەدیدەکرێت کەخۆی زەنندەدارەو پێشەوەی (فتحة)یە.**[١٠٣]

**چوارەم: لادان (الإنحراف)**

**لەزمانەوانیدا: لادانە. لەزاراوەشدا: حەزو لادانی دەنگی پیتەکەیە لەبەر ڕێنەکردنی بەتەواوی، ئەویش بەهۆی ڕێگرتنی لەلایەن زمانەوە.**[١٠٤]

**پیتەکانی: تەنها دوو پیتن: (ل، ر)**

**لادانی دەنگی پیتی (ل) بەرەو هەردوو لای پێشەوەی زمان (واتە بەرەو جێدەنگی نون) ئەویش بەهۆی نوسانی پێشەوەی زمان بەپووکەوە.**

**پیتی (ر)یش پێچەوانەی پیتی (ل) دەنگەکەی لەهەردوو لای پێشەوەی زمانەوە لادەدات بۆ ناوەڕاستی.**

---

[١٠٣] **المنير، لا: ٨٠.**

[١٠٤] **هەندێکی تر لەزانایان پێیان وایە لادانی مەخرەجە، هەندێکی تریشیان پێیان وایە لادانی سیفەتە، لەچاپی یەکەمدا منیش بەلادانی مەخرەج پێناسەمکردبوو بەلام پاش توێژینەوە گەڕانەوە بۆسەرچاوەکان بۆم دەرکەوت کە ڕای یەکەم بەهێزترەو زۆرێك لەتوێژەران پەسەندیان کردووە.**

**بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١٠٣، الجامع الكبير في علم التجويد: (٢/١٣٤-١٣٥)**

ئیبنولجەزەریش دەڵێت:

....................... والإنحرافُ صُحِّحَا ........

فی اللام والرا .......... ............................

**تێبینی: سیفەتی لادان لەپیتی (ل)دا زیاترە لەپیتی(ر)، هەروەها لادانی پیتەکە لەکاتی (شدة)دا زیاترە وەك لەزەننە، لەکاتی زەننەشدا زیاترە وەك لەبزوتن (حرکة).**




بەراوردێك لەنێوان لادانی پیتی (ل) و پیتی (ر)

**پێنجەم: بڵاوبوونەوە (التَّفشّي):**

**لە زمانەوانیدا: بڵاوبوونەوەو فراوانبوونە. لەزاراوەشدا: بڵاوبوونەوەی هەوا لەناو دەمدا لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا، تاوەکو دەگاتە جێدەنگی پیتی (ظ). پیتەکانی: تەنها پیتی (ش)ە.**

**ئیبنولجەزەریش گوتوویەتی:**

............................ وَللتَّفَشِّي (الشِّينُ) .........

**پلەکانی بڵاوبوونەوە (التفشّي):**

١- ئەگەر (شدَّة)داربوو، وەك: ﴿ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾، ﴿ٱلشَّٰكِرِينَ﴾

٢- ئەگەر زەنئەداربوو، وەك: ﴿ٱشۡتَرَىٰ﴾، ﴿ٱلرُّشۡدِ﴾

٣- ئەگەر بزواو بوو، وەك: ﴿شَطَطًا﴾، ﴿شِقۡوَتُنَا﴾.[١٠٥]




---

[١٠٥] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ٩٣، الجامع الكبیر في علم التجوید: (١٤٤/٢).

**شەشەم: دووبارەبوونەوە (التَّكرير):**

**لە زمانەوانیدا: دووبارەبوونەوەیە. لەزاراوەشدا: لەرینەوەی سەر زمانە لەکاتی دەربڕینی پیتەکەدا. پیتەکانی: تەنها پیتی (ر)یە.**

**ئیبنولجەزەریش دەڵێت:**

....... وَالرَّا، وَبِتَكْرِيرٍ جُعِلْ ......................

**مەبەستیش لەباسکردنی ئەم سیفەتە خۆپاراستن و دوورکەوتنەوەیە لێی نەك ئەنجامدانی، ئەمەش ئەوە ناگەیەنی کەخوێنەر بەتەواوی زمانی لەجووڵە بخات، بەڵکو پێویستە سەری زمانی و بەشێك لەپشتەوەی بەتوندی بەپووکی بڕەڕی سەرەوە بنوسێنیٚ، لەگەڵ هێشتنەوەی بۆشاییەکی زۆر تەسك بۆ چوونەدەرەوەی بەشێك لەدەنگی پیتەکە، چونکە پیتی (ر) پیتێکی مامناوەندە لەنێوان هەردوو سیفەتی توندی و نەرمی (الشدَّة والرِّخاوة)دا.**

**پلەکانی دووبارەبونەوە (التّکریر):**

**١- ئەگەر (شدَّة)داربوو، وەك:** ﴿ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

**بۆیە ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

........................ وَأَخْفِ تَكْرِيراً إِذَا تُشَدَّدُ.

**واتە: ئەگەر پیتی (ر) (شدّة)داربوو (تکریر)ەکەی بشارەوە.**

**چونکە پیتی (مشدّد) دوو پیتەو (تکریر)ی زیاترەو پێویستە زیادەڕەوی تێدا نەکرێت.**

**٢- ئەگەر زەنندداربوو، وەك:** ﴿فَٱرۡهَبُونِ﴾

**٣- ئەگەر بزواو بوو، وەك:** ﴿وَتَرَكَهُم﴾.[١٠٦]

---

[١٠٦] **بڕوانە : الجامع الكبير في علم التجويد: (٢/١٤٠).**

**حەوتەم: درێژبوونەوە (الإستطالة):**

**لەزمانەوانیدا: درێژبوونەوە. لەزاراوەشدا: درێژکردنەوەی جێدەنگ لەسەرەتای قەراخی لایەکی زمانەوە (یان هەردوولای) تا دەگاتە جێدەنگی لام. پیتەکانی: تەنها پیتی (ض) دە.**

**پێشەوا ئیبنولجەزەریش دەڵێت:**

والضَّاد باستطالة ومخْرَج          مَيِّزْ من الظَّاء .........

**پلەکانی درێژبوونەوە (الإستطالة):**

**بەهێزترینە ئەگەر (مشدّد) بوو، پاشان ئەگەر زەننەداربوو، پاشانیش ئەگەر بزواو(متحرك)بوو.**[١٠٧]







[١٠٧] سەرچاوەی پێشوو (١٤٨/٢).

پاشماوە: زۆرێك لەپێشەوایانی ئەم زانستە دوو سیفەتی تریان بۆ سیفەتە هەمیشەییە بێدژەکان زیادکردووە، کە بریتین لەسیفەتی شاراوەیی (الخفاء) و مینگە (الغنّة)،[108] بۆیە بەگرنگی دەزانم لێرەدا باسێکیان لێوە بکەین:

سیفەتی یەکەم: شاراوەیی (الخَفاء):

شاراوەیی (الخفاء) لەزمانەوانیدا: شاراوەییە، لەزاراوەشدا: شاراوەیی دەنگی پیتەکە لەکاتی دەربڕینیدا. پیتەکانی: [هـ، پیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ)]، کەلەوشەی (هاوي)دا کۆبوونەتەوە.

(السَّمنودي) دەڵێت:

وَ(الهَاءُ مَعْ حُرُوفِ مَدٍّ) لِلْخَفَا ........................

هۆی ناونانی: لەبەر شاراوەییانە لەکاتی دەربڕیندا. هۆکارەکەشی بریتییە لە:

* پیتی (هـ): لەبەر لاوازی سەرجەم سیفەتەکانی، دووری جێدەنگەکەی بۆیە پێویستە قورئانخوێن بەوریاییەوە ئەم پیتە دەربڕێت.

چۆنێتی چارەسەرکردنی:

ئەگەر زەنندەداربوو: دەربڕینی (هـ)ی زەنندەدار قورسترە لەدەربڕینی (هـ)ی بزواو، بۆیە چارەسەرکردنی بەتەسککردنەوەی جێدەنگەکەیو ئاشکراکردنی سیفەتەکانی دەبێت، بەتایبەت هەردوو سیفەتی چپە (الهمس)و نەرمی (الرِّخاوة) واتە: لەکاتی دەربڕیندا نیوەی هەواو نیوەکەی تریشی دەنگ بێت.

ئەگەر بزواو بوو: پێویستە لەکاتی دەربڕینیدا پەلەی تێدانەکرێتو درێژیش نەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر ڕاناوبوو بە درێژکردنەوەی گەیاندن ( مدالصلة)ی بچووك یان گەورە درێژ دەکرێتەوە.[109]

---

[108] بڕوانە: نهاية القول المفيد ل ٨٦–٨٧، الروضة الندية شرح متن الجزرية ل ٢٨– ٢٩.

[109] بڕوانە: تيسير الرحمن ل ١٠٥– ١٠٧.

* پیتەکانی درێژکردنەوە: چونکە جێدەنگیان خەملێنراوەو لەشوێنێکی دیاریکراوەوە دەرناچن، بەڵکو پیتی هەواییەن و لەگەڵ هەوای بۆشایی (جوف)دا دێنەدەرەوەو لەبەرفراوانی جێدەنگەکەیان دەنگیان لەگەڵ هەوادا دەشارێتەوە.

چارەسەری شاراوەیی (الخفاء)ی پیتەکانی درێژکردنەوە:

بەهێزکردنی ئەم پیتانە، ئەویش بەدرێژکردنەوەی دەنگ بۆماوەیەك کەمترینی (٢) جووڵەبێت، چونکە بێدرێژکردنەوەیان مانای وشەکە دەگۆڕێت، وەك: (یقُول) دەبێتە (یَقُل). جاری واش هەیە ماناکە تێکدەدات، وەك: ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا﴾ دەبێتە (فَسَقَ لَهُمَا)!!

**سیفەتی دووەم: مینگە (الغنة)**

**مینگە: دەنگێکی خۆشە، هاودەنگی هەردوو پیتی (ن، م) دەکات، بەڵام مینگەی پیتی (ن) لەپیتی (م) بەهێزترە.**[110]

**خاوەنی (السلسبیل الشافي) دەڵێت:**

وغُنَّةٌ صَوْتٌ لَذيذٌ رُكِّبـــا        في النُّونِ والمِيمِ عَلَي مَراتِبا.




**پلەکانی مینگە:**

**قورئان خوێنی بەڕێز، ڕای زۆرینە مینگە بەپێنج پلە دیاریدەکەن:**

**١- تەواوترین: لەنون و میمی(شدّة)داردا:**

**أ- لەیەك وشەدا:** ﴿إِنَّ﴾، ﴿يَمُنُّون﴾، ﴿هَمَّت﴾، ﴿وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾.

---

[110] **هەندێ لەزانایان دەڵێن ئەم دەنگە لەدەنگی ئاسك و، بۆڕەی مانگاو، بای نێو گەڵای درەخت دەچێت. بڕوانە: الجامع المفيد في صناعة التجويد للسّنهوري، ل٣٦١و ٣٦٧.**

**پیتەکانی: (ن، م).**

ب- له دوو وشەدا: ئەمیش چوار جۆرە:

- تێهەڵكێشی (ن)ی زەنن‌ەدارو (تنوین) لەپیتی (ن)و (م)دا﴿إِن نَّشَأۡ﴾، ﴿مِن مَّآءٍ﴾

- تێهەڵكێشی پیتی (م) لە(م)دا ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ﴾.

- تێهەڵكێشی (متجانسین) پیتی (ب)ی زەننەدار لە(م)دا:﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾

- تێهەڵكێشی لامی (شمسي) لەنوندا ﴿ٱلنَّاسِ﴾، ﴿ٱلنَّعِيمِ﴾

ئیبنولجەزەریش دەڵێت:

وأظْهِر الغُنَّة من نُون ومِنْ          ميمٍ إذا ما شُدِّدا ........ .

٢- تەواوتر: لەتێهەڵكێشكردنی ناتەواودا (الإدغام الناقص)، واتە: تێهەڵكێشی نونی زەننەدارو (تنوین) لەپیتی(ي) و(و)دا وەك: ﴿فَمَن يُؤۡمِنۢ﴾، ﴿سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾

٣- تەواو: لەنون و میمی شاراوە (المُخفاة)دا، هەروەها هەڵگەڕاندنەوە (القلب)یش دەگرێتەوە:

﴿ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾ (الصّافات ٢١)

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰٓ ﴾ (البقرة ٢٤٦)

٤- ناتەواو: لەنون و میمی زەننەدار و ئاشكرادا . وەك: ﴿يَنۡحِتُونَ﴾، ﴿لَكُمۡ دِينُكُمۡ﴾

٥- ناتەواوترین: لەنون و میمی بزواو (متحرك)دا. ﴿يُنَادَوۡنَ﴾، ﴿نُودِيَ﴾، ﴿مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾[111]

كەواتە مینگە سیفەتێكی وابەستەیە بەپیتی (م)و (ن)ەوە، بەڵام لەدووشێوەی كۆتاییدا دەرناكەوێت و لەهەرسێ شێوەی سەرەتادا پێویستە دەربخرێت، ئەندازەی

[111] بڕوانە: تیسیر الرحمن في تجوید القرآن ل ١١٠-١١١، هدایة القاري للمرصفي ل٩٤-٩٥، الجامع الكبیر في علم التجوید:(٢/١٥٢-١٥٦) .

دوو جووڵە (حركة) درێژبكرێتەوە، بەڵام لەدوو پلەی کۆتاییدا لەیەك جووڵە (حركة) زیاتر درێژ ناکرێنەوە.

**تێبینی:**

یەکەم: مەبەست لەتەواو و ناتەواویی لەسێ پلەی سەرەتادا: (بەهێزی مینگە، تەواوی پشتبەستن بە(خیشوم)و، ناتەواوی مینگە)یە.

بەڵام هەندێك لەزانایان دەڵێن مەبەست پێی درێژکردنەوەی مینگەکانە لەڕووی کات (زمن)ەوە، واتە لەپلەی یەکەمدا زیاتر درێژدەکرێتەوە، دووەمیش لەیەکەم کەمتر، سێیەمیش لەدووەم کەمتر.[112]

دووەم: لەکاتی دەربڕینی مینگەدا دەنگی پیتەکە یان سیفەتەکەی لەکەپوو (خیشوم)ەوە دەردەچێت، نەك پیتەکە خۆی.

سێیەم: مینگەی پیتی (ن) بەهێزترە لەمینگەی پیتی (م).[113]

**گەورەکردن و بچووککردنی مینگە:**

مینگە شوێنی پیتی پاش خۆی دەکەوێت، واتە: گەورە دەکرێت ئەگەر بەدوای نونی زەننەدارو (تنوین)دا یەکێك لەپیتە بەرزەکان (الإستعلاء) هاتبوو، ئەمەش لەکاتی شاردنەوە (الإخفاء)دا دەبێت کاتێك دەگات بەهەر پێنج پیتی (ص، ض، ط، ظ، ق).

**خاوەنی (التحفة) دەڵێت:**

............ وَتَتْبَعُ الأَلِفْ        مَا قَبْلَهَا ، وَالْعَكْسُ فِي الْغَنِّ أُلِفْ

**هەروەها خاوەنی (السلسبيل الشافي)یش دەڵێت:**

وفخِّم الغُنَّة إن تلاها        حروفُ الاستعلاءِ لا سواها

---

[112] تيسير الرحمن ل ١١١، فتح رب البرية شرح المقدمة الجزرية : ل ٣٠.

[113] نهاية القول المفيد ل ٨٧.

نموونه:

﴿يُنصَرُونَ﴾، ﴿مِن صَلۡصَـٰلٖ﴾، ﴿رِيحٗا صَرۡصَرٗا﴾، ﴿مَّنضُودٖ﴾، ﴿لَمَن ضَرُّهُۥٓ﴾، ﴿وَكُلّٗا ضَرَبۡنَا﴾، ﴿يَنطِقُونَ﴾، ﴿مِن طِينٖ﴾، ﴿حَلَٰلٗا طَيِّبٗا﴾، ﴿يَنظُرُونَ﴾، ﴿إِن ظَنَّآ﴾، ﴿ظِلّٗا ظَلِيلًا﴾، ﴿يَنقَلِبُونَ﴾، ﴿مِن قَبۡلِكَ﴾، ﴿عَلِيمٞ قَدِيرٞ﴾ [114]

بەلاٌم ئەگەر بەدوای نونی زەننەدارو (تنوين)دا پیتەكانی تری (الإخفاء) هاتن، ئەوا مینگەیان بچووك دەكرێتەوە، وەك: ﴿ٱلۡإِنسَٰنَ﴾، ﴿كُنتُم﴾، ﴿مِن شَيۡءٖ﴾، ﴿أَنفَقۡتُم﴾

---

[114] بڕوانە: مذكرة في التجويد (٢/١١)، نهاية القول المفيد ل ١٥٨-١٥٩.

## پیت و سیفەتە بەهێزو لاوازەکان

سیفەتە هەمیشەییەکان لەڕووی بەهێزی و لاوازیەوە دەکرێن بەسیٚ بەشەوە:

١-سیفەتە بەهێزەکان: یانزە سیفەتن:

ئاشکرا (الجهر)و توندی (الشدّة)و بەرزیی (الإستعلاء)و جووتکردن (الإطباق)و فیکە (الصفیر)و لەرینەوە (القلقلة)و لادان (الإنحراف)و، دووبارەبونەوە (التكریر)و بلأوبوونەوە (التفشّي)و درێژبونەوە (الإستطالة)و مینگە (الغنّە).

٢- سیفەتە لاوازەکان: شەش سیفەتن:

چپە (الهمس)و نەرمی (الرخاوة)و نزمی (الإستفال)و والأکردن (الإنفتاح)و ئاسان (اللین)و شاراوەیی (الخفاء).

٣- سیفەتی بەهێزو لاوازیان تێدانیە: (الإصمات)و (الإذلاق)و نێوانیی (البینیّة).

هەروەها پیتەکانیش دەکرێن بەپینج بەشەوە:

١- بەهێزترین: (١) پیت: (ط) چونکە هەموو سیفەتەکانی بەهێزن.

٢- بەهێز: (٨) پیت: (ب، ج، د، ر، ص، ض، ظ، ق) چونکە سیفەتە بەهێزەکانی لەلاوازەکانی زیاترە.

٣- مامناوەند: (٥) پیت: (ء، غ، ل، م، ن)، چونکە سیفەتی بەهێزو لاوازیان یەکسانە.

٤- لاواز: (١٠) پیت: (ت، خ، ذ، ز، س، ش، ع، ك، دوو پیتە ئاسانەکە (اللین): و، ي) چونکە سیفەتی لاوازیان زیاترە.

٥- لاوازترین: (٧) پیت: (٤)پیتیان: (ث، ح، ف، ه)هەموو سیفەتەکانیان لاوازە، لەهەمووشیان لاوازتر پیتی (ه) لەبەر سیفەتی شاراوەیی (الخفاء). (٣) پیتیشان: (ا، و، ي) واتە پیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ)، تەنها یەك سیفەتی بەهێزیان تێدایە، ئەویش سیفەتی ئاشکرا (الجهر)ە[١١٥]

---

[١١٥] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١١٧- ١١٨، خوێنەری بەڕێز سەبارەت بەدیاریکردنی سیفەت وپیتە بەهێزو لاوازەکان چەند ڕاوبۆچونێکی تریش هەیە، بەلأم ئەمەی کەباسمانکرد بەهێزترینیانە، خوای گەورەش زاناترە. بۆ زیاتر شارەزابوون سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

نهایة القول المفید ل ٩١- ٩٢، حق التلاوة: ٣٣٨- ٣٣٩، الجامع الكبیر: (٢/١٩٥- ٢٠١).

| پیتەکان | سیــفەتــەکــان | | | | | | | پلەی پیتەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | |
| الهمزة | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | | | مامناوەند |
| الباء | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مذلق | مقلقل | | بەهێز |
| التاء | مهموس | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الثاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاوازترين |
| الجيم | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | مقلقل | | بەهێز |
| الحاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاوازترين |
| الخاء | مهموس | رخوي | مستعل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الدال | جهري | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | مقلقل | | بەهێز |
| الذال | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الراء | جهري | بينية | مستفل | منفتح | مذلق | منحرف | مكرّر | بەهێز |
| الزاي | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | صفيري | | لاواز |
| السين | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | صفيري | | لاواز |
| الشين | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | متفشٍ | | لاواز |
| الصاد | مهموس | رخوي | مستعل | مطبق | مصمت | صفيري | | بەهێز |
| الضاد | جهري | رخوي | مستعل | مطبق | مصمت | مستطيل | | بەهێز |
| الطاء | جهري | شديد | مستعل | مطبق | مصمت | مقلقل | | بەهێزترين |
| الظاء | جهري | رخوي | مستعل | مطبق | مصمت | | | بەهێز |
| العين | جهري | بينية | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| الغين | جهري | رخوي | مستعل | منفتح | مصمت | | | مامناوەند |
| الفاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاوازترين |
| القاف | جهري | شديد | مستعل | منفتح | مصمت | مقلقل | | بەهێز |
| الكاف | مهموس | شديد | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| اللام | جهري | بينية | مستفل | منفتح | مذلق | منحرف | | مامناوەند |
| الميم | جهري | بينية | مستفل | منفتح | مذلق | غنّة | | مامناوەند |

| پیتەکان | سیــفەتــەکــان | | | | | | | پلەی پیتەکە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | |
| النون | جهري | بينية | مستفل | منفتح | مذلق | غنّة | | مامناوەند |
| الهاء | مهموس | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | خفاء | | لاوازترین |
| (و)ی بزواو | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| (ي)ی بزواو | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | | | لاواز |
| پیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ) | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | خفاء | | لاوازترین |
| پیتە ئاسانەکان اللين (و، ي) | جهري | رخوي | مستفل | منفتح | مصمت | لين | | لاواز |

## تەواوکردنی جووڵەکان (إتمامُ الحركات)

**پێویستە لەسەر قورئان خوێن:**

**- لەکاتی دەربڕینی پیتێکی سەردار (مفتوح)دا دەمی بکاتەوە وەك کردنەوەی لەکاتی دەربڕینی پیتی ئەلیفدا.**

**- لەکاتی دەربڕینی پیتێکی بۆردار (مضموم)یشدا هەردوولێوی خڕکاتەوە وەك خڕکردنەوەی لەکاتی دەربڕینی پیتی واودا.**

**- لەکاتی دەربڕینی پیتی ژێردار (مكسور)یشدا شەویلگەی خوارەوەی دابەزێنێ وەك دابەزاندنی لەکاتی دەربڕینی پیتی (ي)دا.**

**- بەڵام پیتی زەنگدار لەمەخرەجی بنچینەیی (أصلي) خۆیەوە دەردەچێت بێ ئەوەی هیچ کام لەوانەی سەرەوەی لەگەڵدابێت.[116]**

**خۆ ئەگەر قورئان خوێن ئەمانەی جێبەجێنەکرد ئەوا خوێندنەکەی ناتەواوە، تەنانەت زانای گەورەی وەك (أحمد الطِّيبي) دەڵێت هەڵەی ئەو کەسە لەڕووی واتاوە لەهەڵەی ئاشکرا (اللحن الجليّ) ناشیرینترە، ئەوەتا لەمەتنەکەیدا[117] دەڵێت:**

| | |
|---|---|
| وَكُلُّ مَضْمُومٍ فَلَنْ يَتِـــــــمَّا | إِلَّا بِضَمِّ الشَّفَتَيْنِ ضَــــــــمَّا |
| وَذُو انْخِفَاضٍ بِانْخِفَاضٍ لِلْفَــمِ | يَتِمُّ وَالْمَفْتُوحُ بِالْفَتْحِ افْهَـــــــمِ |
| إِذِ الْحُرُوفُ إِنْ تَكُنْ مُحَرَّكَـــــهْ | يَشْرَكُهَا مَخْرَجُ أَصْلِ الْحَـــرَكَهْ |
| أيْ مَخْرَجُ الْوَاوِ وَمَخْرَجُ الْأَلِفْ | وَالْيَاءُ فِي مَخْرَجِهَا الَّذِي عُـــرِفْ |
| فَإِنْ تَرَ الْقَـارِئَ لَنْ تَنْطَبِـــقَا | شِفَاهُهُ بِالضَّمِّ كُنْ مُحَـــــــقِّقَا |
| بِأَنَّهُ مُنْتَقِصٌ مَا ضَـــــــــمَّا | وَالْوَاجِبُ النُّطْقُ بِهِ مُتَــــــــمَّا |
| كَذَاكَ ذُو فَتْحٍ وَذُو كَسْرٍ يَجِبْ | إِتْمَامُ كُلٍّ مِنْهُمَا افْهَمْهُ تُصِـــبْ |
| فَالنَّقْصُ فِي هَذَا لَدَى التَّأَمُّـلِ | أَقْبَحُ فِي الْمَعْنَى مِنَ اللَّحْنِ الْجَـلِي |
| إِذْ هُوَ تَغْيِيرٌ لِذَاتِ الْحَــرْفِ | وَاللَّحْنُ تَغْيِيرٌ لَهُ بِالْوَصْـــــــفِ |

[116] أطلس التجويد ل ٨٩.

[117] المفيد في علم التجويد ل ٧.

## بەشی پێنجەم
## سیفەتە کاتیەکان (الصفات العرضیة)

سیفەتە کاتیەکان (الصفات العارضة): ئەو سیفەتانەن کە تەواوکەری پیتەکەن و لەهەندێ کاتی دیاریکراودا تووشی پیت دەبن، لەهەندێ کاتیشدا لەبەر هۆکاری لەهۆکارەکان لێی جیادەبنەوە، ژمارەیان یازدە سیفەتە، وەك: ئاشکراکردن (الإظهار)و تێهەڵکێش (الإدغام)و شاردنەوە (الإخفاء)و هەڵگەڕاندنەوە (القلب)و بچووککردنەوە (الترقيق)و گەورەکردن (التفخيم)و درێژکردنەوە (المدّ)و کورتکردنەوە (القصر)و جوڵاندن (التحريك)و زەننەدارکردن (الإسکان)و وەستان بەبێ هەناسە (السَکت).[118]
(السمّنودي) لەبارەیانەوە دەڵێت:[119]

إِظْهَارٌ ادْغَامٌ وَقَلْبٌ وَكَـذَا      إِخْفَا وَتَفْخِيمٌ وَرِقٌّ أُخِـــــــذَا
وَالمَدُّ وَالقَصْرُ مَعَ التَّحَرُّكِ      وَأَيضًا السُّكُونُ وَالسَّكْتُ حُكِـي

---

[118] بڕوانە: حق التلاوة ل ٢١٣و٢٣٨

[119] لآلئ البيان في تجويد القرآن: إبراهيم على شحاتة السمنودي ل ٤.

## گەورەکردن و بچووککردن (التفخيم والترقيق)

گەورەکردن (التفخيم): لەزاراوەدا قەڵەویەکە دەچێتە ناو لەشی پیتەکەوە، واتە: ناو دەم پڕدەکات لەدەنگی ئەوپیتە.[١٢٠] لەبەر تەسکبوونەوەی گەرووو بەرزبوونەوەی دەنگ بەرەو مەڵاشوو. بچووکردنەوەی پیتیش بەپێچەوانەوەیە.[١٢١]







پیتەکانی زمانی عەرەبی لەڕووی گەورەو بچووکی (تفخیم و ترقیق)ەوە دەکرێن بەسێ بەشەوە:

١- ئەو پیتانەی هەمیشە بەگەورەیی (مفخّم) دەخوێنرێنەوە.

٢- ئەو پیتانەی هەمیشە بەبچووکی (مرقّق) دەخوێنرێنەوە.

٣- ئەو پیتانەی هەندێجار بەگەورەیی، هەندێجاریش بەبچووکی دەخوێنرێنەوە.

---

[١٢٠] بڕوانە: نهاية القول المفيد ل ١٢٧.

[١٢١] أطلس التجويد: (١/١٥٥، ١٥٦)

**یەکەم: ئەو پیتانەی هەمیشە بە گەورەیی دەخوێنرێنەوە:**

**ئەو پیتانەی هەمیشە بەگەورەیی دەخوێنرێنەوە بریتین لە (٧) پیتە بەرزەکان (الإستعلاء: خص ضغط قظ)، لەنێویشیاندا پیتەکانی جووتکردن (الإطباق) سیفەتی گەورەکردنیان زیاترە (ص، ض، ط، ظ ).**

**بەشێوەیەکی گشتی ڕیزبەندییان- لەگەورەترینەوە- بەم شێوەیە دەبێت:**

**(ط، ض، ص، ظ، ق، غ، خ )**[١٢٢]

**ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

وَحَرْفَ الاسْتِعْلاَءِ فَخِّمْ وَاخْصُصَا الاطْبَاقَ أَقْوَى نَحْوَ قَالَ وَالْعَصَا.[١٢٣]

**دووەم: ئەو پیتانەی کە هەمیشە بە بچووکی دەخوێنرێنەوە:**

**هەموو پیتە نزمەکان (الإستفال) بەبچووکی دەخوێنرێنەوە جگە لەپیتی (ر)و لامی وشەی پیرۆزی ﴿ٱللَّه﴾و، پیتی ئەلیف. واتە: (ء، ب، ت، ث، ج، ح، د، ذ، ز، س، ش، ع، ف، ك، م، ن، ه، و، ي)**

**ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

فَرَقِّقَنْ مُسْتَفِلًا مِنْ أَحْرُفِ ......................

---

[١٢٢] **بڕوانە: أحكام قراءة القرآن للحصري ل ١٤٩.**

[١٢٣] بڕوانە: لاپەڕە: (٧٧-٧٠)

**سێیەم: ئەو پیتانەی هەندێجار بەگەورەو هەندێجاریش بە بچووك دەخوێنرێنەوە.**

ئەمانەن: ئەلیف، پیتی (ر)، لامی وشەی پیرۆزی ﴿ٱللّه﴾، پشت بەخوای گەورە لێرەدا باسیان دەکەین:

## پیتی (ر)

ئەم پیتە سێ دۆخی هەیە، چونکە جار هەیە بەگەورەو جاریش هەیە بەبچووكو جاریش هەیە بەهەردوو دۆخەکە دەخوێنرێتەوە:

**یەکەم–پیتی (ر) لەحاڵەتی گەورەییدا ( تفخیم):**[١٢٤]

١- ئەگەر خۆی سەری هەبوو. وەك: ﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ﴾

٢- ئەگەر خۆی زەنندارو پیتی پێشەوەی سەری هەبێ. وەك: ﴿أَرۡبَعِينَ﴾، ﴿مَرۡيَم﴾، ﴿لَا تَذَرۡ﴾

٣- ئەگەر خۆی بەهۆی وەستانەوە زەننەی هەبوو، هەروەها پیتی پێشتریش زەننەی هەبوو–بەمەرجێك پیتی (ي) نەبێت–و پیتی پێش ئەویش سەری هەبێت، وەك: ﴿وَٱلۡفَجۡرِ﴾، ﴿ٱلۡقَدۡرِ﴾، ﴿ٱلنَّارِ﴾، ﴿ٱلۡقَرَارِ﴾.

٤- ئەگەر بۆر (ضمة)ی هەبوو. وەك: ﴿كَفَرُوا﴾، ﴿ٱلرُّعۡبَ﴾، ﴿تَعۡرُجُ﴾

٥- ئەگەر خۆی زەنندارو پیتی پێشەوەی بۆری هەبێ.

وەك: ﴿ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾، ﴿ٱلۡقُرۡءَانِ﴾، ﴿أَنِ ٱشۡكُرۡ﴾

٦- ئەگەر خۆی بەهۆی وەستانەوە زەننەی هەبێ، پیتی پێشتریش زەننەو پێشتریش بۆری هەبێت:

﴿وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ﴾ الحج: (٤١)، ﴿إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ﴾ الإنشقاق: (١٤).

---

[١٢٤] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١٤٦-١٤٨.

**٧- ئەگەر خۆی زەنندەدارو لەهەمان وشەدا پیتی پێشەوەی ژێری ڕەسەنی (كسرة أصلي) هەبێت، بەڵام پیتی دواوەی یەكێك بێت لەپیتە بەرزەكان (الإستعلاء: خُصَّ ضَغطٍ قِظ) بەمەرجێك ژێر (كسرة)ی نەبێت، ئەمیش تەنها لەم پێنج وشەدا ڕوویداوە:**

﴿قِرۡطَاس﴾، ﴿وَإِرۡصَادٗا﴾، ﴿فِرۡقَة﴾، ﴿مِرۡصَادٗا﴾، ﴿لَبِٱلۡمِرۡصَادِ﴾

**ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

إِنْ لَمْ تَكُنْ مِنْ قَبْلِ حَرْفِ اسْتِعْلاَ ...........................

**٨- ئەگەر خۆی زەنندەی هەبێ و هەمزەی گەیاندن (الوصل) لەپێشیەوە هاتبێت.**

﴿ٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمۡ﴾[يوسف: ٨١]، ﴿ ٱلَّذِى ٱرۡتَضَىٰ﴾[النور:٥٥]،

﴿رَبِّ ٱرۡجِعُونِ﴾[المؤمنون:٩٩]،

**ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

........................ أَوْ كَانَتِ الكَسْرَةُ لَيْسَتْ أَصْلاَ.

دووەم: پیتی (ر) لەدۆخی بچووکی (مرقّق)یدا: [125]

١- ئەگەر خۆی ژێری هەبێ. وەك: ﴿فَضْرِب﴾، ﴿رِزْقًا﴾، ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾

ئیبنولجەزەری دەڵێت:

وَرَقِّقِ الرَّاءَ إِذَا مَا كُسِرَتْ ..........................

٢- ئەگەر خۆی زەنندەی هەبێ و پیتی پێشەوەی ژێری ڕەسەنی هەبێ و لەیەك وشەدا بێت، لەدواشیەوە پیتێك لەپیتە بەرزەکان (الاستعلاء) نەبێ، وەکو:

﴿فِرْعَوْن﴾، ﴿ٱلْفِرْدَوْس﴾، ﴿شِرْعَة﴾، ﴿أَشِر﴾، ﴿فِيهَا صِرٌّ﴾، ﴿وَنُقِر﴾

ئیبنولجەزەری دەڵێت:

كَذَاكَ بَعْدَ الْكَسْرِ حَيْثُ سَكَنَتْ ..........................

٣- ئەگەر بەهۆی وەستانەوە زەنندەی هەبوو بەدوای پیتێکی زەنندداریشدا هاتبوو جگە لەپیتە بەرزەکان (الإستعلاء)و پێش پیتە زەنندارەکەش ژێر هەبێت.

وەکو: ﴿ٱلسِّحْر﴾، ﴿ٱلذِّكْر﴾، ﴿حِجْر﴾

٤- ئەگەر خۆی بەهۆی وەستانەوە زەنندەی هەبێت و لەپاش (ي)یەکی زەنندارەوە هاتبێت، جا ئەو (ي)یە پیتی درێژکردنەوە (المدّ) بێت وەکو: ﴿بَصِير﴾، ﴿قَدِيرٌ﴾

یاخود پیتە ئاسانەکان (اللین) بێت، وەکو: ﴿ ٱلسَّيْر﴾، ﴿خَيْر﴾

٥- ئەگەر لەکۆتایی وشەیەکدا زەنندەی هەبوو، هەروەها پیتی پێشەوەی ژێری ڕەسەنی هەبوو، بەدوایدا لەوشەیەکی تردا پیتێکی بەرز (الإستعلاء) هاتبوو، ئەم دۆخەش سێجار لەقوڕئانی پیرۆزدا ڕوویداوە: ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ﴾(لقمان: ١٨)

﴿فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلاً﴾، (المعارج: ٥) ﴿أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ﴾ (نوح: ١)

---

[125] بڕوانە : تیسیر الرحمن ١٤٨-١٤٩.

**٦- ئەگەر بەدوایدا پیتێکی لارکراوە (مُمال) هەبوو، ئەم دۆخەش لەقورئانی پیرۆزدا یەکجار ڕوویداوە، (لە ریوایەتی حفص)دا):** ﴿ٱرۡكَبُواْ وَقَالَ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآ﴾ (هود: ٤١)

**پێشەوا (الشاطبي) دەڵێت:**

وَلكِنَّهَا في وَقْفِهِمْ مَعْ غَيْرِهاَ     تُرَقِّقُ بَعْدَ الْكَسْرِ أَوْ مَا تَمَيَّلاَ.

سێیەم: پیتی (ر) لەنێوان هەردوو دۆخی (تفخیم)و (ترقیق)دا[١٢٦]:

ئەمیش دوو حاڵەتی هەیە:

- بەگەورەیی و بەبچووکی دەخوێنرێتەوە، بەڵام بچووك باشترە، ئەمیش سێ جۆرە:

١- ئەگەر پیتی (ر) زەنەداربوو بەهۆی وەستانەوە، بەدوایدا پیتێکی یای سڕاوە (محذوف) هاتبوو، ئەمە لەسێ وشەدا ڕوویداوە:

﴿وَنُذُرِ﴾ کەلە سورەتی (القمر)دا شەش جار هاتووە.

﴿يَسْرِ﴾ یەك جار لەسورەتی (الفجر: ٤)دا هاتووە.

﴿أَسْرِ﴾ پێنج جار هاتووە، سێ جاریان پیتی (ف)ی لەپێشەوەیەو دوو جاریشیان پیتی (أن)، ئەمەش ناوی سورەتو ژمارەی ئایەتەکانیانە: (هود:٨١)، (الحجر:٦٥)، (الدخان: ٢٢)، (طه: ٧٧)، (الشعراء: ٥٢)

ئەوەی بەباریکی دەیخوێنێتەوە سەیری بنچینەی وشەکان دەکات، ئەویش پیتی (ي) سڕاوەیە، بۆیە وەستان وەکو گەیاندن لێدەکات. ئەو کەسەشی بەگەورەیی دەیخوێنێتەوە سەیری بنچینەی وشەکە ناکات، بەڵکو بەپیتێکی زەنەداری کاتی (عارض) دادەنێت.

٢- ئەگەر خۆی زەنەو پیتی پێشەوەیشی ژێری ڕەسەن بێ و گەیشتبێت بەپیتێکی بەرز (الإستعلاء) بەمەرجێك ژێردار (مكسور) بێت. ئەم جۆرەش یەکجار لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ﴾ (الشعراء : ٦٣)

ئیبنولجەزەری دەڵێت:

وَالْخُلْفُ فِي فِرْقٍ لِكَسْرٍ يُوجَدُ ........................

---

[١٢٦] بڕوانە: تيسير الرحمن ١٤٨-١٤٩.

٣- ئەگەر خۆی زەنندەداربوو بەهۆی وەستانەوەو لەدوای پیتێکی زەنندەداری بەرز (الاستعلاء) هاتبیٚ‌و ئەویش لەدوای پیتێکی ژێردارەوە هاتبیٚ. هەروەها ئەم جۆرەش یەکجار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ﴾ (سبأ : ١٢)

جائەوەی گەورەی دەکات سەیری پیتە بەرزەکە (الإستعلاء) دەکات، ئەوەش بچووکی دەکاتەوە سەیری پیتە بەرزەکە ناکات، بەڵکو سەیری ژێری (کسرة) پێش پیتە بەرزەکە دەکات.

- بەگەورەیی و بەبچووکی دەخوێنرێتەوە، بەڵام لەکاتی وەستاندا گەورەکردن باشترە:

ئەگەر بەهۆی وەستانەوە خۆی زەنندەی هەبوو، بەڵام بەدوای پیتێکی زەنندەداری بەرز (الإستعلاء)دا هاتبیٚ‌و ئەویش بەدوای پیتێکی ژێرداردا هاتبیٚ. ئەمەش تەنها لەیەك وشەدا ڕوویداوە: ﴿ٱدْخُلُواْ مِصْرَ﴾ (یونس: ٨٧، یوسف:٢١،٩٩، الزخرف:٥١)

(المتولي) دەڵێت:

واختِيرَ أَنْ يُوقَفَ مثلَ الوَصلِ        في راء مصرَ القطرَ يَا ذَا الفَضلِ



## پیتی (ل)

پیتی (ل) لەم بارانەی خوارەوەدا بەگەورەیی دەخوێنرێتەوە:

١- لامی وشەی پیرۆزی (الله) ئەگەر سەر یان بۆر لەپێشیەوە هاتبوو. وەك: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ (الإخلاص: ١) ، ﴿نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ﴾ (الهمزة: ٦)

٢- لامی وشەی پیرۆزی (الله) ئەگەر لەسەرەتاوە هاتبوو. چونكە هەمزەی (وصل) لەسەرەتاوە سەری دەبێت. وەك: ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ...﴾ (البقرة ٢٥٧)

ئیبنولجەزەری دەڵێت :

وفَخِّمِ اللاَّمَ من اسْمِ الله          عن فتْحٍ أو ضَمٍّ كَعَبْدُ الله.

لەم بارانەی خوارەوەشدا بەبچووكی دەخوێنرێتەوە:

١- لامی وشەی پیرۆزی (الله) ئەگەر ژێری ڕەسەن یان كاتی (عارض)ی لەپێشەوە بوو، وەكو:

﴿مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ﴾ (الأنفال ١٠)، ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ ﴾ (الزمر ٤٦)،﴿ قَوۡمًا ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ ﴾ (الأعراف ١٦٤)

چونكە (قَوْماً اللّهُ) بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: (قَوْمَنِ الله).[١٢٧]

٢-ئەگەر پیتێكی زەننەداری لەپێشەوە بوو، پێش پیتە زەنەدارەكە پیتێكی ژێردار هاتبوو. وەك: ﴿غَيۡرُ مُعۡجِزِى ٱللَّهِ﴾ (التوبة:٢) ﴿فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ﴾ (المائدة: ٥٤).




[١٢٧] بڕوانە: مذ كرة في التجويد: (١٠/٢).

## پیتی (الألف)

پیتی (الألف) بەگەورەکردن (التفخیم)و بچووککردن (الترقیق) وەسف ناکرێت، بەڵکو پێش پیتی خۆی دەکەوێ لەکاتی خوێندنەوەدا.

خاوەنی (لآلیء البیان) دەڵێت:[128]

......... وتتبعُ ما قَبلَها الألِفْ　　　والعكس في الغنِّ أُلِفْ

واتە :ئەگەر لەپێشیەوە پیتێکی بەرز (الإستعلاء) هاتبوو ئەوا بەگەورەیی دەخوێنرێتەوە وەکو: ﴿طَاب﴾، ﴿ضَاقَتْ ﴾، ﴿صَابِرًا﴾، ﴿يُظَٰهِرُون﴾، ﴿يُقَٰتِلُون﴾، ﴿غَآبِين﴾، ﴿خَآبِين ﴾، هەروەها پیتی ئەلیف بەگەورەیی دەخوێنرێتەوە ئەگەر پیتی (ر) لەپێشیەوە هاتبوو: ﴿صِرَٰط﴾، ﴿وَرَآءِهِم﴾، لەوشەی پیرۆزی ﴿ٱللَّه﴾یشدا بەهەمان شێوەیە.

ئەگەر لەپێشیەوە پیتێکی نزم (الإستفال) هاتبوو، ئەوا بەبچووکی دەخوێنرێتەوە.

﴿ٱلْأَخِر﴾، ﴿وَٱلْأَسْبَاط﴾، ﴿ٱلتَّٰئِبُون﴾، ﴿ثَانِيَ﴾، ﴿جَآء﴾، ﴿ٱلْحَٰمِدُون﴾، ﴿ٱلدَّار﴾، ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰت﴾، ﴿ زَاهِقٌ ﴾، ﴿سَاق﴾، ﴿شَآء﴾، ﴿ٱلْعَٰلَمِين﴾، ﴿ٱلْفَآئِزُون﴾، ﴿ٱلْكَٰفِرُون﴾، ﴿ٱلَّتِي﴾، ﴿ٱلْمَال﴾، ﴿ ٱلنَّارِ ﴾، ﴿هَارٍ﴾، ﴿وَٰحِدٍ﴾، ﴿إِلْيَاس﴾.

ئیبنولجەزەری بەم شێوەیە ئاماژەی پێکردووە:

......................　　　وَحَاذِرَنْ تَفْخِيمَ لَفْظِ الأَلِفِ




[128] بڕوانە: هداية القاري إلى تجويد كلام الباري ل٩٧.

## بەشی پێنجەم

## تێهەڵکێشکردن (الإدغام)

تێهەڵکێشکردن بریتیە لەخوێندنەوەی دوو پیت بەپیتێکی (شدّة)دار لەکاتی دەربڕیندا.

تێهەڵکێشکردن دەکرێت بەدوو بەشی سەرەکی یەوە:

تێهەڵکێشی گەورە: تێهەڵکێشکردنی پیتێکی بزواو (متحرّك) لەپیتێکی بزواوی تردا، بەشێوەیەك كە ببنە پیتێکی (شدّة)دار.

هۆی ناونانی: چونکە کاری زۆری پێویستە، یەکەمیان: زەنندارکردنی پیتی جوولاوی یەکەم، دووەمیش: تێهەڵکێشکردنی (الإدغام) لەپیتی دووەمدا.[129]

ئەمجۆرە تێهەڵکێشەش لەڕیوایەتی (حفص)دا لە جۆری لێکچووەکان (المتماثلين)ەو لەشەش شوێنی قورئانی پیرۆزدا ڕوویداوە:

١- ﴿...فَنِعِمَّا هِيَ ۖ﴾ (البقرة:٢٧١) لە بنچینەدا (فنعمَ مَا) بووە.

٢- ﴿نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ﴾ (النساء: ٥٨).

٣- ﴿قَالَ أَتُحَـٰٓجُّوٓنِّى﴾ (الأنعام: ٨٠) لە بنچینەدا (أتحاجِجُونَنِي) بووە.

٤- ﴿لَا تَأۡمَ۫نَّا﴾ (يوسف: ١١) لە بنچینەدا (تأمنُنَا) بووە.

٥- ﴿قَالَ مَا مَكَّنِّى﴾ (الكهف:٩٥) لە بنچینەدا (مكّنَنِي) بووە.

٦- ﴿ تَأۡمُرُوٓنِّىٓ ﴾ (الزمر : ٦٤) لە بنچینەدا (تأمرونَنِي) بووە.[130]

---

[129] تێهەڵکێشی گەورە (الإدغام الكبير) لەزۆربەی سەرچاوەکاندا بەو تێهەڵکێشە دەوترێ لەنێوان دوو پیتدا دەبێت کەهەردووکیان بزواون [پیتەکان یان لێکچوو (متماثلين)ن یان لێك نزیك (متقاربين)ن]، ئەم تێهەڵکێشە تایبەتە بەڕیوایەتی (السوسي) لە(أبو عمرو البصري)ەوە، لەهەندێ شوێندا (حمزة)ش لەگەڵیدا بەشدارە ... بۆیە پێیدەوترێ گەورە (الكبير) لەبەر زۆر دووبارەبوونەوەی (لكثرة وروده) بە پێچەوانەی تێهەڵکێشی بچووك (الإدغام الصغير)ەوە کە کەمتر دووبارە دەبێتەوە. (د. دیاری أحمد)

[130] بڕوانە: حق التلاوة ل٢٤٠.

**تێهەڵکێشی بچووك: بریتییە لەتێهەڵکێشکردنی پیتێکی زەنندار لەگەڵ پیتێکی بزواودا بەشێوەیەك کەهەردووکیان پیتێکی (شدّة)دار لەڕەگەزی پیتی دووەم دروستبکەن.**

**ئەویش سێ جۆری هەیە:**

**١- تێهەڵکێشی پیتە لێکچووەکان (إدغام المتماثلين).**

**٢- تێهەڵکێشی پیتە هاوڕەگەزەکان ( إدغام المتجانسين).**

**٣- تێهەڵکێشی پیتە لەیەك نزیکەکان ( إدغام المتقاربين).**

**١- تێهەڵکێشی پیتە لێکچووەکان (إدغام المتماثلين):**

**بریتییە لەو تێهەڵکێشەی لەنێوان دوو پیتی لێکچوو لەجێدەنگ و سیفەتدا ڕوودەدات، جا ئەو دوو پیتە لەیەك وشەدا یاخود لەدوو وشەدا کۆببنەوە.**

**ئەم تێهەڵکێشەش دەبێت بەدوو بەشەوە:**

**أ- مینگەدار، ئەویش تەنها لەپیتی (ن)و (م)دا:**

- ﴿لَن نَّصۡبِرَ عَلَىٰ طَعَامٖ وَٰحِدٖ﴾ (البقرة ٦١)

- ﴿قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ (يونس ٥٧)

**ب- بێ مینگە، ئەویش لەم پیتانەی خوارەوەدا:**

**- پیتی (ب) لە(ب)دا:** ﴿ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا﴾ (النمل: ٢٨) **بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: اِذهبِّكتابي.**

**- پیتی (ت) لە(ت)دا:** ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ﴾ (البقرة:١٦) **بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە: فَمَا رَبِحَتِّجرتُهُم.**

**- پیتی (د) لە(د)دا:** ﴿وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلۡكُفۡرِ﴾ (المائدة: ٦١)

**- پیتی (ذ) لة(ذ)دا:** ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا﴾ (الأنبياء ٨٧)

**- پیتی(ف)لە(ف)دا:** ﴿فَلَا يُسۡرِف فِّي ٱلۡقَتۡلِۖ﴾ (الإسراء ٣٣)

- پیتی (ك) لة(ك)دا: ﴿أَيۡنَمَا تَكُونُواْ يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾ (النساء ٧٨)

- پیتی (ل) له(ل)دا: ﴿قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ﴾ (الأنعام ١٩)

- پیتی (و) له(و)دا: ﴿حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ﴾ (الأعراف: ٩٥)

بەلاَم ئەگەر پیتی یەکەم پیتی درێژکردنەوە (المدّ) بوو تێهەڵکێش قەدەغەیە:

- ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ (الرعد ٢٩)

- ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفًا وَطَمَعًا﴾ (الرعد ١٢)

تێبینی: ئایەتی ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ۝٢٨ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ﴾(الحاقة ٢٨، ٢٩)

لەحاڵەتی گەیاندن (الوصل)دا بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە:

✓ ئاشکراکردن (الإظهار): ئەویش بەوەستان (سَکتة) لەسەر وشەی (مَالِيهْ) پاشان خوێندنی (هلكَ) بیٚ هەناسەدان.

✓ تێهەڵکێشکردن (الإدغام): بەم شێوەیە (مَالِيهَّلكَ)، بەلاَم شێوەی یەکەم لەپێشترە.[131]

[131] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن للحصري ل: ١٢٤-١٢٦، أحكام التجويد ل: ٤٠- ٤١.

٢- تێهەڵکێشی پیتە هاوڕەگەزەکان (إدغام المتجانسين):

بریتییە لەو تێهەڵکێشەی لەنێوان دوو پیتی یەکگرتوو لەجێدەنگو جیاواز لەسیفەتدا ڕوودەدات بەمەرجێك پیتی یەکەم زەنندەدارو دووەم بزواو بێت، ئەم جۆرەش لەحەوت شوێندا هەیەو بەسەر سێ جێدەنگدا دابەشدەبن:

أ- مەخرەجی (ط، ت، د): لەچوار شوێندا پێویستە:

- تێهەڵکێشکردنی ناتەواوی پیتی (ط)ی زەنندەدار لە(ت)دا:

﴿لَئِنۢ بَسَطتَ﴾ (المائدة ٢٨) واتە: بە (بسـطـت) دەخوێنرێتەوە، چونکە هەردوو سیفەتی بەرزیی (الإستعلاء) و جووتکردن (الإطباق)ی پیتی (ط) ماوەتەوە.

- تێهەڵکێشکردنی تەواوی پیتی (ت)ی زەنندەدار لە ( ط )دا:

﴿وَدَّت طَّآئِفَةٌ﴾ (آل عمران ٦٩) بە(ودطّائفة) دەخوێنرێتەوە.

- تێهەڵکێشکردنی تەواوی پیتی (ت)ی زەنندەدار لە (د)دا:

﴿ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ ﴾ (الأعراف ١٨٩)، بە( أَثْقَلَدَّعَوا) دەخوێنرێتەوە.

- تێهەڵکێشکردنی تەواوی پیتی (د)ی زەنندەدار لە(ت)دا:

﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ ﴾ (البقرة:٢٥٦) بە (قتّبيَّن) دەخوێنرێتەوە.

ب- جێدەنگی (ظ، ذ، ث): ئەمیش لەدوو شوێندا پێویستە:

- تێهەڵکێشکردنی پیتی (ذ)ی زەنندەدار لە(ظ)دا کەدووجار لەقورئاندا هاتووە:

﴿إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ (النساء:٦٤)، بە(إظّلموا) دەخوێنرێتەوە.

﴿وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ إِذ ظَّلَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ﴾ (الزخرف: ٣٩)

بە (إظّلمتُم) دەخوێنرێتەوە.

- **تێهەڵکێشکردنی پیتی (ث)ی زەنەدار لە(ذ)دا:**

﴿أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَث ذَّٰلِكَ ... ﴾ (الأعراف: ١٧٦) **بە(يلهذَّلك) دەخوێنرێتەوە.**

**ج- جێدەنگی (ب، م): ئەمیش لەیەك شوێندا پێویستە:**

**تێهەڵکێشکردنی پیتی (ب) لە(م)دا** ﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾ (هود: ٤٢)[١٣٢] **بە(ارِكمَّعنا) دەخوێنرێتەوە.**

**ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

| | |
|---|---|
| وَأَوَّلَيْ مِثْلٍ وَجِنْسٍ إِنْ سَكَنْ | أَدْغِمْ كَ: قُل رَّبِّ وَ: بَل لاَّ، وَأَبِنْ |
| فِي يَوْمِ، مَعْ: قَالُواْ وَهُمْ ... | ................................ |

---

[١٣٢] بڕوانە: علم التجويد، د يحيى عبدالرزاق الغوثاني ل ١٢٥-١٢٦.

٣- تێهەڵکێشی پیتە لە یەك نزیکەکان (إدغام المتقاربين):

بریتییە لەو تێهەڵکێشەی لەنێوان دوو پیتی نزیکی یەك لەجێدەنگ‌و سیفەتدا ڕوودەدات، بەڵام دەبێت پیتی یەکەم زەنندەارو دووەم بزواو بێت، ئەمجۆرەش لەقورئانی پیرۆزدا لەنێوان دوو جێدەنگدا ڕوویداوە:

أ- پیتی (ل) و (ر):

﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمًا﴾ (طه ١١٤) ، ﴿ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ ﴾ (النساء ١٥٨)

ب- پیتی(ق)و (ك):

﴿أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ﴾ (المرسلات ٢٠)

تێبینی:

١- سەبارەت بەخوێندنەوەی وشەی ﴿نَخۡلُقكُّم﴾ لەریوایەتی (حفص)دا بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە:

* تێهەڵکێشکردنی تەواو: تێهەڵکێشی تەواوی پیتی (ق) لەپیتی (ك)دا، واتە: بە(ألم نَخلُكّم) دەخوێنرێتەوە.

* تێهەڵکێشکردنی ناتەواو: واتە هێشتنەوەی هەردوو سیفەتی جووتکردن (الإطباق)و بەرزیی (الإستعلاء)ی پیتی (ق). بەڵام تێهەڵکێشکردنی تەواو لەپێشترە.[١٣٣]

بۆیە ئیبنولجەزەری وتوویەتی:

......................... ....... وَالخُلْفُ بِنَخْلُقْكُمْ وَقَعْ.

٢- لەئایەتی ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم﴾ (المطففين:١٤) تێهەڵکێش ڕوونادات، چونکە ئەرکە بۆمان لەسەر وشەی (بَلْ) بوەستین. واتە (سکت) بکەین.

---

[١٣٣] بڕوانە: علم التجويد، د يحيى عبدالرزاق الغوثاني ل ١٢٨.

## لامی ناساندن ( لام التعريف )[١٣٤]

لامی ناساندن: لامێکی زەنەداری زیادەیە هەمزەیەکی (وصل)ی سەر (فتحة)دار پێشی دەکەوێت و ناوێکیش بەدوایدا دێت. دوو جۆری هەیە:

یەکەم: (الزائدة اللازمة): ئەو لامەیە کەهەمیشە لکاوە بەسەرەتای وشەکەوەو لێی جیانابێتەوە. وەك: ﴿ٱلَّتِي﴾، ﴿ٱلله﴾، ﴿ ٱلَّتِي﴾، ﴿ ٱلَّذِي﴾، ﴿ ٱلَّذِينَ﴾، ﴿ ٱلَّذَانِ﴾، ﴿ٱلَّٰٓـِٔي﴾، ﴿ ٱلۡـَٰٔنَ﴾، ﴿ وَٱلۡيَسَعَ﴾

حوکمەکەی: ئەگەر بەدوایدا لام هاتبوو پێویستە تێهەڵکێش بکرێت وەك حەوت نموونەی سەرەتا، ئەگەر بەدوایشیدا پیتێکی تر هاتبوو

– جگە لەلام – پێویستە ئاشکرابکرێت وەك دوو نموونەی کۆتایی.

دووەم: (الزائدة غير اللازمة): ئەو لامەیە کە لکاوە بەسەرەتای وشەکەوەو دەکرێت لێی جیابێتەوە.

ئەمیش دوو جۆری هەیە:

---

١٣٤ بڕوانە: أحكام قراءة القرآن ١٩٩–٢٠٣، تيسير الرحمن ل١٩٥–١٩٨

## یەکەم: لامی (قَمَري)

ئەو لامە زەننەدارەیە لەپێش یەکێك لەچواردە پیتە (قمري)ەکانەوە دێتو دەنووسرێتو ئاشکرا دەکرێت. پیتە (قمري)ەکانیش ئەمانەن: (أ، ب، غ، ح، ج، ك، و، خ، ف، ع ، ق، ي، م، ه).

خاوەنی (التحفة) لەبارەیانەوە دەڵێت:

لِلاَمِ أَلْ حَالاَنِ قَبْلَ الأَحْرُفِ     أُولاَهُمَا إِظْهَارُهَا فَلْتَــــعْرِفِ

قَبْلَ ارْبَعٍ مَع عَّشْرَةٍ خُذْ عِلْمَهُ     مِنِ( ابْغِ حَجَّكَ وَخَفْ عَقِيمَهُ)

نموونە:

| پیتەکان | نموونە | پیتەکان | نموونە |
|---|---|---|---|
| ء | ﴿ٱلۡأَرۡض﴾ | ف | ﴿ٱلۡفَتَّاح﴾ |
| ب | ﴿ٱلۡبَارِئ﴾ | ق | ﴿ٱلۡقُدُّوس﴾ |
| ج | ﴿ذُو ٱلۡجَلَٰلِ﴾ | ك | ﴿ٱلۡكَبِير﴾ |
| ح | ﴿ٱلۡحَكِيم﴾ | م | ﴿ٱلۡمُصَوِّرُ﴾ |
| خ | ﴿ٱلۡخَٰلِق﴾ | ه | ﴿ٱلۡهُدَىٰ﴾ |
| ع | ﴿ٱلۡعَزِيز﴾ | و | ﴿ٱلۡوَهَّاب﴾ |
| غ | ﴿ٱلۡغَفَّٰر﴾ | ي | ﴿ٱلۡيَمِين﴾ |

نیشانەی لە(مصحف)دا: دانانی زەننە (سەرە پیتی ح) لەسەر پیتی لامەکە.

## دووەم: لامی (شَمسي)

ئەو لامە زەنندارەیە لەپێش یەکێك لەچواردە پیتە (شمسي)ەکانەوە دێتو دەنووسرێتو ناخوێنرێتەوە، بەڵکو تێهەڵکێش دەکرێت لەپیتە (شمسي)ەکەدا بەبێ مینگە تەنها پیتی (ن) نەبێت مینگەی هەیە. پیتە (شمسي)ەکانیش ئەمانەن: (ط، ث، ص، ر، ت، ض، ذ، ن، د، س، ظ، ز، ش، ل)

خاوەنی (التحفة) لەیەکەم پیتی وشەکانی دێڕی دووەمی ئەم شیعرەدا کۆیکردوونەتەوە:

ثَانِيهِمَا إِدْغَامُهَا فِي أَرْبَـــــــعِ وَعَشْرَةٍ أَيْضًا وَرَمْزَهَا فَــــــــعِ
طِبْ ثُمَّ صِلْ رَحْمًا تَفُزْ ضِفْ ذَا نِعَم دَعْ سُوءَ ظَنٍ زُرْ شَرِيفًا لِلْكَـــــــرَم
وَالَّلامَ الأُولَى سَمِّهَا قَمْرِيَّــــــــةْ وَالَّلامَ الأُخْرَى سَمِّهَا شَمْسِــــــــيَّةْ

نموونە:

| پیتەکان | نموونە | پیتەکان | نموونە |
|---|---|---|---|
| ت | ﴿ٱلتَّوَّاب﴾ | ش | ﴿ٱلشُّهَدَآء﴾ |
| ث | ﴿ٱلثَّوَاب﴾ | ص | ﴿ٱلصَّلَوٰة﴾ |
| د | ﴿ٱلدُّنيَا﴾ | ض | ﴿ٱلضَّآلِّين﴾ |
| ذ | ﴿ٱلرَّحِيم﴾ | ط | ﴿ٱلطَّلَٰق﴾ |
| ر | ﴿ٱلرَّقِيب﴾ | ظ | ﴿ٱلظَّٰلِمُون﴾ |
| ز | ﴿ٱلزَّكَوٰة﴾ | ل | ﴿ٱلَّيل﴾ |
| س | ﴿ٱلسَّلَٰم﴾ | ن | ﴿ٱلنَّار﴾ |

نیشانەی لە(مصحف)دا: دانانی (شدة) لەسەر پیتی دوای لامەکە.

## بەشی شەشەم

## یاساکانی نونی زەننەدارو ( تنوین )

نونی زەننەدار (ساكن): نونێكی زەننەدارە لە ناو (اسم)و كردار (فعل)و پیت (حرف)دا، لەهەردوو حاڵەتی وەستانو گەیاندندا، لە كۆتاییو ناوەڕاستی وشەدا بەدیدەكرێتو دەنوسرێتو دەخوێنرێتەوە.

(التنوین): نونێكی زەننەدارەو لە كۆتایی ناو (اسم)دایە، نانوسرێتو تەنها لە بە یەكگەیشتنی دوو وشەدا دەخوێنرێتەوە، نیشانەی دوو سەر یاخود دوو ژێر یاخود دوو بۆری بۆ دادەنرێت.

لەكاتی بە یەكگەیشتنی نونی زەننەدار یاخود (تنوین) بە یەكێك لەپیتەكانی زمانی عەرەبی چوار دۆخو بار دروستدەبێت، كە ئەمانەن:

١- ئاشكراكردن (الإظهار).

٢- تێهەڵكێشكردن (الإدغام).

٣- هەڵگەڕاندنەوە (القلب).

٤- شاردنەوە (الإخفاء).

ئیبنولجەزەری لەپێشەكیەكەیدا بەم شێوەیە باسی كردوون:

وَحُـكْمُ تَنْوِيْنٍ وَنُونٍ يُلْـــفَى     إِظْهَارٌ ادْغَامٌ وَقَلْبٌ اخْـــــفَا
فَعِنْدَ حَرْفِ الحَلْقِ أَظْهِرْ وَادَّغِمْ     فِي اللاَّمِ وَالرَّا لاَ بِغُنَّةٍ لَـــــزِمْ
وَأَدْغِمَنْ بِغُنَّةٍ فِي يُومِـــــنُ     إِلاَّ بِكِلْمَةٍ كَدُنْيَا عَنْــوَنُـــــوا
وَالقَلْبُ عِنْدَ البَا بِغُنَّةٍ كَـــــذَا     لاخْـفَا لَدَى بَاقِي الحُرُوفِ أُخِذَا

یەکەم: ئاشکراکردنی گەروویی (الإظهار الحلقي):

ئاشکراکردن‌و دەرخستنی نونی ساکن یاخود (تنوین) لەجێدەنگی خۆیەوە بێ ئەوەی مینگە (غنّة)ی لەگەڵدا بێت، یاخود لەسەری بوەستین. ئەم ئاشکراکردنەش لەکاتێکدایە نونی زەننەدار یاخود تەنوین لەگەڵ شەش پیت لەپیتەکانی زمانی عەرەبی بەیەك بگەن.

**پیتەکانی**: ئەو شەش پیتانە پێیان دەگوترێ پیتەکانی ئاشکراکردن (الإظهار) یاخود پیتەکانی گەروو (الحلق) کە بریتین لە: (ء، هـ، ع، ح، غ، خ) کە لەسەرەتای ئەم وشانەدا کۆکراونەتەوە: أخي هَاكَ عِلماً حَازه غيرُ خاسِر.

ئاشکراکردنی نونی زەننەدار (ساکن) لەیەك وشەداو لە دوو وشەدا ڕوودەدات، بەڵام ئاشکراکردنی (تنوین) لەدوو وشەدا نەبێت ڕوونادات.

پلەکانی ئاشکراکردن:

*(ء، هـ)، ئاشکراکردنی نون یاخود (تنوین) لەگەڵ ئەم دوو پیتەدا ڕوونترە، چونکە دوورترین پیتەکانی گەرووە لەجێدەنگی نونەوە.

**(ع، ح)، ئاشکراکردنی نون یاخود (تنوین) لەگەڵ ئەم دوو پیتەدا مامناوەندە، چونکە دەکەونە ناوەڕاستی گەرووەوە.

***(غ، خ)، ئاشکراکردنی نون یاخود (تنوین) لەگەڵ ئەم دوو پیتەدا لەوانیتر کەمترە، چونکە نزیکترین پیتەکانی گەروون لەجێدەنگی نونەوە.[١٣٥]

[١٣٥] أحكام قراءة القرآن الكريم للحصري ل ١٧١.

نموونە:

| ژمارە | پیت | لەگەڵ نونی زەننەدار لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا | لەگەڵ (تنوین)دا |
|---|---|---|---|---|
| ١ | الهمزة | ﴿يَنۡـَٔوۡنَ﴾ | ﴿مَنۡ ءَامَنَ﴾ | ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ |
| ٢ | الهاء | ﴿يَنۡهَوۡنَ﴾ | ﴿إِنۡ هَٰذَآ﴾ | ﴿سَلَٰمٌ هِيَ﴾ |
| ٣ | العين | ﴿ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ | ﴿مِّنۡ عَمَلِ﴾ | ﴿أَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ |
| ٤ | الحاء | ﴿تَنۡحِتُونَ﴾ | ﴿مِنۡ حَكِيمٍ﴾ | ﴿غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ |
| ٥ | الغين | ﴿فَسَيُنۡغِضُونَ﴾ | ﴿مِنۡ غِلّٖ﴾ | ﴿لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ |
| ٦ | الخاء | ﴿وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ﴾ | ﴿مِّنۡ خَرۡدَلٍ﴾ | ﴿لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ |

**تێبینی: بۆ ناسینەوەی نونی زەننەدار لەحاڵەتی ئاشکراکردندا لە قورئانی پیرۆزدا زانایان سەری پیتی (ح)یان بە بچووکی لەسەر نونەکە داناوە، وەك: ﴿أَنۡعَمۡتَ﴾ بۆ (تنوین)یش لەهەمان حاڵەتدا نیشانەی ـٌ ـً ـٍ یان داناوە.**

دووەم: تێهەڵکێشکردن (الإدغام):

بریتیە لە بەیەکگەیشتنی نونی زەنندار یاخود (تنوین) لەگەڵ شەش پیتی زمانی عەرەبی. پیتەکانی: (ي، ر، م، ل، و، ن) * لەوشەی (یرمُلون)دا کۆکراونەتەوە[١٣٦].

بەشەکانی تێهەڵکێشکردن دووجۆرە:

١- تێهەڵکێشکردنی مینگەدار (إدغامٌ بغنّة)

بریتی یە لەبەیەکگەیشتنی نونی زەنندار یاخود (تنوین) لەگەڵ (چوار) لەو شەش پیتە کەبریتین لەپیتەکانی وشەی (یَنمُو) یان (یُوْمِن). ئەمیش دەکرێت بەدوو بەشەوە:

أ- تێهەڵکێشی تەواوی مینگەدار (إدغامٌ کاملٌ بغنّة):

پیتەکانی: دوو پیتی هەیە (ن، م). بۆیە پێی گوتراوە تەواو چونکە پیتی یەکەم (نونی زەنندار یاخود تنوین) بەتەواوی – بەپیتو سیفەتی مینگە – تێهەڵکێشی پیتی دووەم بووە.

نیشانەی لە(مصحف)دا: نیشانەی (شدّة)ی لەسەر پیتی دووەم بۆ دانراوە.

نموونە:

هاتنی نون بەدوای نونی زەننەداردا: ﴿مِّن نَّذِيرٍ﴾

هاتنی میم بەدوای نونی زەننەداردا: ﴿مِّن مَّسَدِۭ﴾

هاتنی نون بەدوای (تنوین)دا: ﴿يَوۡمَئِذٖ نَّاعِمَةٞ﴾

هاتنی میم بەدوای (تنوین)دا: ﴿صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ﴾

ب- تێهەڵکێشی ناتەواوی مینگەدار (الإدغامُ الناقص بغنّة )

ئەمیش دوو پیتی هەیە: (و، ي)، بەڵام لێرەدا نونی زەننەدار یاخود (تنوین)ەکە بەتەواوی تێهەڵکێشی پیتی دووەم نەبووە، چونکە سیفەتی مینگەکەی ماوەتەوە، هەر بۆیە پێی وتراوە ناتەواو.[١٣٧]

---

* (یرمُلون) واتە: پەلەدەکەن، بە(یرمِلون)ەش دەخوێنرێتەوە.

[١٣٦] إعانة المستفيد بضبط متني التحفة والجزرية في علم التجويد.

نموونه:

هاتنی واو بەدوای نونی زەننەداردا: ﴿مِن وَالٍ﴾

هاتنی (یا) بەدوای نونی زەننەداردا: ﴿مَن يُؤْمِنُ﴾

هاتنی واو بەدوای (تنوین)دا: ﴿رَحِيمٌ وَدُودٌ﴾

هاتنی (یا) بەدوای (تنوین)دا: ﴿خَيْرًا يَرَهُۥ﴾

نیشانەی لە(مصحف)دا: نیشانەی (شدّة)ی بۆ دانەنراوە.[138]

٢- تێهەڵکێشی بێ مینگە (إدغامٌ بلا غنّة)

بریتییە لە بەیەکگەیشتنی نونی زەننەدار یاخود (تنوین) لەگەڵ دوو پیتەکەی تردا کە (ل، ر) یە. لێرەدا مینگە دروستنابێت، چونکە هیچ سیفەتێکی نونەکە نامێنێ.

نموونە:

هاتنی (لام) بەدوای نونی زەننەداردا: ﴿فَإِن لَّمْ﴾، ﴿وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ﴾

هاتنی (را) بەدوای نونی زەننەداردا: ﴿وَمِن رِّبَاطِ﴾، ﴿مِن رَّبِّكَ﴾

هاتنی (لام) بەدوای (تنوین)دا: ﴿فَسَلَٰمٌ لَّكَ﴾، ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾

هاتنی (را) بەدوای (تنوین)دا: ﴿أَخْذَةً رَّابِيَةً﴾، ﴿ثَمَرَةٍ رِّزْقًا﴾

---

[137] بڕوانە: السهل المفيد فی أحكام التجويد: إبراهيم أحمد. ل٢٦.

[138] بڕوانە: تيسير الرحمن ل ١٧٨.

چەند تێبینیەك:[139]

١- تێهەڵکێشکردن لە دوو وشەدا ڕوو دەدات، بەڵام ئەگەر لەیەك وشەدا بوو دەبێت ئاشکرا (الإظهار) بکرێت‌و پێیدەگوترێت ئاشکراکردنی ڕەها (الإظهارُ المطلق)و لەقورئاندا لەچوار وشەدا ڕوویداوە: (الدّنْيا، صِنْوان، قِنْوان، بُنْيان).

٢- لەدوو جێگەی قورئانی پیرۆزدا تێهەڵکێش ڕوونادات، بەڵکو نونە زەنگدارەکە ئاشکرا دەکرێت:

﴿يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ (يس ١-٢)

﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾ (القلم ١)

٣- لەوشەی ﴿طسٓمٓ﴾ ی سورەتی (الشعراء)و (القصص) تێهەڵکێشکردنی نونی زەنگدار لەپیتی میمدا پێویستە.

٤- لەئایەتی: ﴿وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ﴾ (القيامة: ٢٧)، تێهەڵکێش ڕوونادات، چونکە پێویستە لەسەر وشەی (مَنْ) بوەستین.

٥- لەحاڵەتی وەستان (وقف) لەسەر نونی زەنگدار پێویست (واجب)ە نونەکە ئاشکرا بکرێت.

[139] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن للحصري ل ١٧٤- ١٧٦، هداية القاري للمرصفي ل ٨٦-٨٨.

**سێیەم: هەڵگەڕاندنەوە (القَلب)[١٤٠]:**

**بریتیە لەهەڵگەڕاندنەوەی نونی زەننەدار یا (تنوین) بەمیمێکی شاراوە بەمینگەوە، لەکاتی گەیشتنی بەپیتی (ب)دا. ئەوەش بەسێ هەنگاو دەبێت:**

**١- هەڵگەڕاندنەوەی نونی زەننەدار یان (تنوین) بۆ میمێکی تەواو.**

**٢- شاردنەوەی میمەکە لەبەرگەیشتنی بەپیتی (ب)، هاوکات لەگەڵ داخستنی هەردوو لێو بەهێواشی و بێفشار بۆ ئەوەی نەبێتە میمێکی (شدّة)دار.**

**٣- دەرخستنی مینگە بەئەندازەی دوو (حرکة)، پاشان داخستنی لێو بەتەواوی (بەبێ فشار) بۆ دەربڕینی پیتی (ب).**



**شێوەی دوو لێو لەکاتی دەربڕینی نونی هەڵگەڕاوە بەمیم**

**ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

وَالقَلْبُ عِنْدَ البَا بِغُنَّةٍ كَذَا        لِاخْفَا لَدَى بَاقِي الحُرُوفِ أُخِذَا.

---

[١٤٠] **بەکارهێنانی دەستەواژەی (إقلاب) هەڵەیە، چونکە (إفعال) تەنها لە (أَفعَل) وەردەگیرێت، کەواتە لەبەر بەکارنەهێنانی (أَقلَب) نابێت (إقلاب) بەکاربهێنرێت. بڕوانە: أحکام قراءة القرآن للحصري ل ١٧٩.**

**تێبینی:**

**هەڵگەڕاندنەوە (القلب) لەیەك وشەو لەدوو وشەدا ڕوودەدات.**

**نیشانەی لە(مصحف)دا: بۆحاڵەتی هەڵگەڕاندنەوەی (قلب) نونی زەننەدار میمێکی بچووکی لەسەر دانراوە، بۆ (تنوین)یش: جووڵە (حرکة)یەکی لابراوەو بەدوایدا میمێکی بچووك دانراوە.**

**نموونە:**

- ﴿وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ﴾ (البيّنة: ٤)
- ﴿لَئِن كَلَّا لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ﴾ (العلق: ١٥)

**چوارەم: شاردنەوەی ڕاستەقینەیی (الإخفاء الحقيقي):**

**بریتیە لەدەربڕینی نونی زەننەدار یاخود (تنوین) لەگەڵ (١٥) پیت لەپیتەکانی زمانی عەرەبیدا، بەشێوەیەك نە ئاشکراکردنی تەواوو نە تێهەڵکێشکردنی تەواو دەبێت، لەگەڵ هێشتنەوەی مینگە (غُنَّة) بەئەندازەی دوو جووڵە (حرکة) بۆ پیتە شاراوەکە.**

**بە (الإخفاء الحقيقي) ناودەبرێت بۆجیاکردنەوەی لەشاردنەوەی لێوی (گەشتنی نونی زەننەدار بەپیتی ب).**

**پیتەکانی: (ث، ج، ذ، ز، س، ص، ض، ظ، ف، ش، ط، د، ت، ق، ك).**

**(الجمزوري) دەڵێت:**

فـــــي خَمْسَةٍ مِنْ بَعْدِ عَشْرٍ رَمْزَهَا     في كِلْمِ هذَا البَيْتِ قَدْ ضَمَّنْتُهَا
صِفْ ذَا ثَنَا كَمْ جَادَ شَخْصٌ قَدْ سَمَا     دُمْ طَيِّبًا زِدْ فِي تُقًى ضَعْ ظَالِمَا

**چۆنێتی شاردنەوە (الإخفاء):**

**١- ئامادەکردنی دەم بۆ جێدەنگی پیتی دواتر، واتە: دەبێت مینگە بۆنی پیتی پاش خۆی لێبێت.[١٤١]**

**٢- دەرکردنی مینگەیەکی تەواو لەکەپووەوە.**

**٣- لەگەڵ دەرچوونی دەنگێکی سووك لەدەمەوە ئەویش بە هۆی دانەخستنی جێدەنگی نون لەگەڵ پیتەکانی شاردنەوە (الإخفاء)دا جگە لە پیتی (ق)و (ك) کە جێدەنگ لەگەڵیاندا بە تەواوی دادەخرێت.[١٤٢]**

---

[١٤١] **بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ١٨٣.**

[١٤٢] **أطلس التجويد: (٣٠١/١).**










**تێبینی:**

**١- ئەگەر پیتەكانی شاردنەوە (الإخفاء) لەپیتە بەرزەكان (الإستعلاء) واتە: (ص، ض، ط، ظ، ق) بوو پێویستە مینگەی شاردنەوەكە گەورە بكرێت. ئەگەر لە پیتە نزمەكان (الإستفال) بوو، پێویستە مینگەكە بچووك بكرێتەوە.**

**خاوەنی (السلسبيل الشافي) دەڵێت:**

**وفَخِّمِ الغُنَّةَ إِنْ تَلاها حُرُوفُ الإِستِعلاءِ لا سِواها.**

**٢- لە (مصحف)دا بۆ نونی زەنندار لەحاڵەتی شاردنەوە (الإخفاء)دا هیچ جووڵەیەكی (حركة) بۆ دانەنراوە، بۆ (تنوين)یش هەردوو (حركة)كە بەشوێن یەكدا دانراون.**

## پلەکانی شاردنەوە:[143]

١- بەهێزترین: لەگەڵ پیتەکانی (ط، د، ت) لەبەر نزیکیی جێدەنگیان لەجێدەنگی پیتی نونەوە، واتە: جێدەنگی نون‌و (تنوین) تا نزیکتربن لەجێدەنگی پیتەکانی شاردنەوە (الإخفاء)ەوە زیاتر دەشاردرێنەوە، ئەویش بەکەمێك دوورخستنەوەی زمان لەجێدەنگی نون و پشتبەستنی تەواو بەجێدەنگی کەپوو (الخيشوم) بۆ زیاتر ئاشکراکردنی مینگەکەیان.

٢- لاوازترین: لەگەڵ هەردوو پیتی (ق، ك)دا، لەبەر دووری جێدەنگیان لەجێدەنگی پیتی نونەوە، واتە: پلەی ئاشکراکردنی مینگەکانیان کەمترە.

٣- مامناوەند: لەگەڵ (١٠) پیتەکەی تردا، چونکە جێدەنگیان نەزۆر دوورو نەزۆریش نزیکە لەپیتی نونەوە.

جیاوازی نێوان تێهەڵکێش (الإدغام) و شاردنەوە (الإخفاء):

١- لە شاردنەوەدا (شدة) نییە، بەڵام لەتێهەڵکێشی تەواودا (شدة) هەیە، هەر بۆیە مینگە لەتێهەڵکێشی تەواودا کامڵترە لەمینگە لەشاردنەوەدا.

٢- شاردنەوە لەلای پیتەکەدایە، تێهەڵکێشیش لەپیتەکەدایە، دەڵێیت: پیتی نونم لەلامدا تێهەڵکێشکرد نەك لەلای لامدا، هەروەها دەڵێیت: نونم لەلای پیتی دالدا تێهەڵکێش کرد نەك لەدالدا.

٣- شاردنەوە لەیەك وشەو لەدوو وشەدا ڕوودەدات، بەڵام تێهەڵکێش تەنها لەدوو وشەدا ڕوودەدات.

٤- شاردنەوە هەمیشە بەمینگەوەیە، بەڵام تێهەڵکێش بەمینگەو بەبێ مینگەش هەیە.[144]

---

[143] بڕوانە: الروضة النديّة شرح متن الجزرية ل٢٤، تيسير الرحمن ل ١٨٤، هداية القاري ل: ٩٢، المنير ل: ١٠٠- ١٠١.

[144] أحكام قراءة القرآن ل: ١٨٨، تيسير الرحمن ل: ١٨٣.

نموونە:

| پیتەکان | لەیەک وشەدا | لەدوو وشەدا | پاش تنوین |
|---|---|---|---|
| ت | ﴿أَنتُم﴾ | ﴿مِن تَحۡتِهَا﴾ | ﴿وَفَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ﴾ |
| ث | ﴿مَّنثُورٗا﴾ | ﴿مِن ثَمَرَةٖ﴾ | ﴿جَمِيعٗا ثُمَّ﴾ |
| ج | ﴿أَنجَيۡنَٰكُم﴾ | ﴿مَن جَآءَكَ﴾ | ﴿فَصَبۡرٞ جَمِيلٞ﴾ |
| د | ﴿أَندَادٗا﴾ | ﴿مِّن دِيَٰرِكُمۡ﴾ | ﴿قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ﴾ |
| ذ | ﴿مُنذِرِينَ﴾ | ﴿مِّن ذُنُوبِكُمۡ﴾ | ﴿قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ﴾ |
| ز | ﴿أَنزَلَ﴾ | ﴿مَن زَكَّىٰهَا﴾ | ﴿يَوۡمَئِذٖ زُرۡقٗا﴾ |
| س | ﴿يَنسِلُونَ﴾ | ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم﴾ | ﴿عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ﴾ |
| ش | ﴿أَنشَأۡتُم﴾ | ﴿فَمَن شَآءَ﴾ | ﴿نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا﴾ |
| ص | ﴿يُنصَرُونَ﴾ | ﴿مِن صَلۡصَٰلٖ﴾ | ﴿رِيحٗا صَرۡصَرٗا﴾ |
| ض | ﴿مَّنضُودٖ﴾ | ﴿لَمَن ضَرُّهُۥٓ﴾ | ﴿وَكُلّٗا ضَرَبۡنَا﴾ |
| ط | ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ﴾ | ﴿مِن طِينٖ﴾ | ﴿حَلَٰلٗا طَيِّبٗا﴾ |
| ظ | ﴿يَنظُرُونَ﴾ | ﴿إِن ظَنَّآ﴾ | ﴿ظِلّٗا ظَلِيلًا﴾ |
| ف | ﴿أَنفُسَكُم﴾ | ﴿مِّن فَوۡقِهِمۡ﴾ | ﴿خِزۡيٞ فِي﴾ |
| ق | ﴿يَنقَلِبُونَ﴾ | ﴿مِن قَبۡلِكَ﴾ | ﴿عَلِيمٞ قَدِيرٞ﴾ |
| ك | ﴿مِّنكُم﴾ | ﴿إِن كَانَتۡ﴾ | ﴿فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ﴾ |

## بەشی حەوتەم

## یاساکانی میمی زەننەدار ( ساكن )

**میمی زەننەدار لەگەڵ پیتەکانی زمانی عەرەبیدا سێ دۆخی هەیە:**

**(الجمزوري) لە(التحفة)دا دەڵێت:**

أحكامُهَا ثلاثةٌ لمنْ ضَبَطْ        إخفاءٌ ادغامٌ وإظهارٌ فَقَطْ.

**یەکەم: شاردنەوەی لێوی (الإخفاء الشفوي):**

**بریتییە لەشاردنەوەی میمی زەننەدار لە کاتی گەشتنی بە پیتی (ب) لەگەڵ مانەوەی مینگە. ئەویش بەداخستنی هەردوو لێو بەهێواشی، پێیدەوترێ شاردنەوەی لێوی لەبەرئەوەی هەردووپیتی (م، ب) لەلێوەوە دەردەچن.**

**(الجمزوري) دەڵێت:**

فَالأَوَّلُ الإِخْفَاءُ عِنْدَ الْبَاءِ        وَسَمِّهِ الشَّفْوِيَّ لِلْقُرَّاءِ

**بۆچونێکی تریش هەیە میمی زەننەدار ئاشکرادەکات لەکاتی گەشتنی بەپیتی(ب)دا، بەڵام شاردنەوەی بەهێزترە لەسەر ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان.**

**ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

............................        ............... وَأَخْفِيَــــــنْ

الْمِيْمَ إِنْ تَسْكُنْ بِغُنَّةٍ لَدَى        بَاءٍ عَلَى الْمُخْتَارِ مِنْ أَهْلِ الأدَا.[١٤٥]

**تێبینی: لە(مصحف)دا میمی زەننەداری شاراوە نیشانەی زەننە (سكون)ی بۆ دانەنراوە. بۆ نموونە:**

﴿سَلۡهُمۡ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ﴾ ( القلم: ٤٠)

﴿فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾ ( النازعات: ١٤)

---

[١٤٥] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن ل: ١٩٠.

**جیاوازی نێوان هەڵگەڕاندنەوەو (القلب) شاردنەوەی لێوی (الإخفاء الشفوي):**

**لە جێدەنگ و دەربڕیندا وەك یەكن و لەم خاڵانەی خوارەوەدا جیاوازن:**

**١- لەهەڵگەڕانەوەدا پیتی میم پیتێكی ڕەسەن (أصلي) نییە، بەڵكو هەڵگەڕاوەیە، بەڵام لەشاردنەوەی لێویدا ڕەسەنە.**

**٢- لە شاردنەوەی لێویدا زانایان دوو ڕایان هەیە، هەندێكیان دەڵێن: ئاشكرا دەكرێت و زۆربەشیان دەڵێن: لەگەڵ مینگەدا دەشارێتەوە، بەڵام هەڵگەڕاندنەوە یەكدەنگی زانایانی لەسەرە.**

**٣- شاردنەوەی لێوی لەدوو وشەدا ڕوودەدات، بەڵام هەڵگەڕاندنەوە لەیەك وشەو لەدوو وشەشدا ڕوودەدات.[١٤٦]**

**جیاوازی نێوان شاردنەوەی ڕاستەقینەیی و (الإخفاء الحقیقي) شاردنەوەی لێوی (الإخفاء الشفوي):**

**١- لەشاردنەوەی ڕاستەقینەییدا نونی زەنندار بەتەواوی لەناودەچێت و تەنها مینگەكەی دەمێنێتەوە، بەڵام لەشاردنەوەی لێویدا نونی زەنندار بەتەواوی لەناو ناچێت ئەویش لەبەر نزیكیی جێدەنگی لەجێدەنگی پیتی (ب)وە.**

**٢- زانایان لەشاردنەوەی ڕاستەقینەییدا یەكدەنگن، بەڵام لەشاردنەوەی لێویدا جیاوازن.[١٤٧]**



**شێوەی دوو لێو لەكاتی دەربڕینی میمی شاراوەدا**

---

[١٤٦] **تیسیر الرحمن ل ١٨٩.**

[١٤٧] **تیسیر الرحمن ل: ١٨٩.**

### دووەم: تێهەڵکێشکردنی لێوی (الإدغام الشفوي)

بریتییە لە تێهەڵکێشکردنی پیتی (م)ی زەنگدار لە کاتی گەیشتنی بە میمێکی بزواودا، بە شێوەیەك کە هەردووکیان ببنە میمێکی (مشدّد)ی مینگەدار.

ئەم تێهەڵکێشەش ناتەواوە، چونکە سیفەتی پیتەکە کە مینگەیە دەمێنێتەوە، تێهەڵکێشی بچووك و لێکچوو (المتماثلین)یشی پێدەوترێت. بچووکە چونکە پیتی یەکەمیان زەنگدارە، لێکچووە چونکە هەردوو پیتەکە لەجێدەنگ و سیفەتدا یەکیان گرتووە. نموونە:

﴿ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾ (قريش ٤)

﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ﴾ (الهمزة ٨)

### سێیەم: ئاشکراکردنی لێوی (الإظهار الشفوي)[١٤٨]:

بریتییە لەئاشکراکردنی میمی زەنگدار لەکاتی گەیشتنی بەپیتەکانی تری زمانی عەرەبی جگە لە(م، ب)، بە تایبەت لە گەڵ هەردوو پیتی (ف، و)دا زۆر ئاشکراترە لەبەر جیاکردنەوەیان لەیەکتر، چونکە جێدەنگەکانیان لەیەکەوە نزیکە.

ئیبنولجەزەری دەڵێت:

وَأظْهِرَنْهَا عِنْدَ بَاقِي الأَحْرُفِ        وَاحْذَرْ لَدَى وَاوٍ وَفَا أنْ تَخْتَفِي

پێیشی دەگوترێ لێوی (شفوي)، چونکە جێدەنگی پیتی میم هەردوولێوە.

خاوەنی (التحفة) دەڵێت:

وَالثَّالِثُ الإِظْهَارُ فِي الْبَقِيَّهْ        مِنْ أَحْرُفٍ وَسَمِّهَا شَفْوِيَّهْ

سەرنج: لەم ئایەتەدا هەرسێ حوکمەکەی میمی زەنگدار کۆبووەتەوە:

﴿طَٰٓئِرُكُم قَالُواْ مَّعَكُمْۚ أَئِن ذُكِّرْتُمۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾(يس:١٩)

---

[١٤٨] بڕوانە: تيسير الرحمن ل ١٩١-١٩٢ ، البسيط في علم التجويد ل ٢٩-٣٠

لەم ئایەتەشدا هەرسێ حوکمەکەی میمی زەنندار بە هەردوو پیتی (ف، و)یشەوە کۆبونەتەوە:

﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَـٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (النساء:١٥)

نموونە:

| پیتەکان | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا |
|---|---|---|
| الهمزة | ﴿ٱلظَّمْـَٔانُ﴾ | ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ |
| التاء | ﴿أَمْتًا﴾ | ﴿أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَـٰمُهُم﴾ |
| الثاء | ﴿أَمْثَـٰلَهُم﴾ | ﴿مَّرْجِعُكُمْ ثُمَّ﴾ |
| الجيم | _ | ﴿وَمَا جَعَلْنَـٰهُمْ جَسَدًا﴾ |
| الحاء | ﴿يَمْحَقُ﴾ | ﴿أَمْ حَسِبْتَ﴾ |
| الخاء | _ | ﴿أَمْ خُلِقُوا۟﴾ |
| الدال | ﴿وَأَمْدَدْنَـٰهُم﴾ | ﴿عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۗ﴾ |
| الذال | - | ﴿وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم﴾ |
| الراء | ﴿أَمْرًا ۖ﴾ | ﴿رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ |
| الزاي | ﴿رَمْزًا ۗ﴾ | ﴿أَمْ زَاغَتْ﴾ |
| السين | ﴿تُمْسُونَ﴾ | ﴿فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ﴾ |
| الشين | ﴿أَمْشَاجٍ﴾ | ﴿لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ﴾ |
| الصاد | _ | ﴿وَهُمْ صَـٰغِرُونَ﴾ |

| پیتەکان | لەیەك وشەدا | لەدوو وشەدا |
|---|---|---|
| الضاد | ﴿وَٱمۡضُواْ﴾ | ﴿أَلۡفَوۡاْ ءَابَآءَهُمۡ ضَآلِّينَ﴾ |
| الطاء | ﴿وَأَمۡطَرۡنَا﴾ | ﴿مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ﴾ |
| الظاء | – | ﴿وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ |
| العين | ﴿أَمۡعَآءَهُمۡ﴾ | ﴿أَمۡ عِندَهُمُ﴾ |
| الغين | _ | ﴿فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ﴾ |
| الفاء | _ | ﴿وَهُمۡ فَرِحُونَ﴾ |
| القاف | _ | ﴿بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ يَعۡدِلُونَ﴾ |
| الكاف | ﴿فَيَمۡكُثُ﴾ | ﴿إِلَيۡكُمۡ كِتَٰبٗا﴾ |
| اللام | ﴿وَأَمۡلَىٰ﴾ | ﴿أَمۡ لَهُمۡ﴾ |
| النون | ﴿تُمۡنَىٰ﴾ | ﴿مَّسَّتۡهُمۡ نَفۡحَةٞ﴾ |
| الهاء | ﴿يَمۡهَدُونَ﴾ | ﴿بُرۡهَٰنَكُمۡۖ هَٰذَا﴾ |
| الواو | ﴿أَمۡوَٰتٞ﴾ | ﴿حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ﴾ |
| الياء | ﴿عُمۡيٗا﴾ | ﴿أَمۡ يُرِيدُونَ﴾ |

**تێبینی: بۆ حاڵەتی ئاشکراکردنی میمی زەننەدار لە(مصحف)ی پیرۆزدا سەرە پیتی (ح)ی بۆدانراوە.**

## حوكمی میم و نونی (شدّة)دار

دەرخستنی مینگە (الغنّة) لەكاتی دەربڕینی میمو نونی (شدّة)داردا ئەركە، ئەگەر لەیەك وشەشدا بێت.

نموونە بۆ نونی (شدّة)دار: ﴿إِنَّا﴾، ﴿ٱلۡجِنَّة﴾

نموونە بۆ میمی (شدّة)دار: ﴿ٱلۡمُزَّمِّل﴾، ﴿هَمَّت﴾، ﴿ثُمَّ﴾

## بەشی هەشتەم
## درێژکردنەوە (المدّ)و بەشەكانی

درێژكردنەوە (المدّ): بریتیە لە درێژكردنەوەی دەنگ بە یەكێك لەپیتەكانی درێژكردنەوە (المدّ) یاخود یەكێك لە پیتە ئاسانەكان (اللين).

(موسى)ی كوڕی (يزيد الكندي) دەڵێت: (ابن مسعود) – خوای لێ ڕازیبێت – گوێی لە خوێندنی پیاوێك دەگرت، كاتێك گەشتە ئایەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ ...﴾ (التوبة:٦٠) بەبێ درێژكردنەوە (المدّ) خوێندیەوە، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو شێوەیە بۆ منی نەخوێندەوە. پیاوەكەش وتی: ئەی چۆن بۆی خوێندیتەوە؟ وتی: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ ...﴾ بە درێژكردنەوە (المدّ)ەوە خوێندیەوە.[149]

پیتەكانی درێژكردنەوە (المدّ):

(ألف)ی زەنندەدار پیتی پێشەوەی سەر (فتحة) بێ وەك: ﴿قَال﴾

(و)ی زەنندەدار پیتی پێشەوەی بۆر (ضَمَّة) بێ وەك: ﴿يَقُول﴾

(ي)ی زەنندەدار پیتی پێشەوەی ژێر (كَسْرَة) بێ وەك: ﴿قِيل﴾

هەر سێكیان لەوشەی: ﴿نُوحِيهَا﴾، ﴿أُوذِينَا﴾، ﴿وَأُوتِينَا﴾ كۆبونەتەوە.

پیتەكانی ئاسان (اللين):

(و)ی زەنندەدار پیتی پێشەوەی سەر (فتحة)بێ وەك: ﴿خَوْف﴾

(ي)ی زەنندەدار پیتی پێشەوەی سەر (فتحة) بێ وەك: ﴿ٱلۡبَيۡت﴾

---

[149] بڕوانە: السلسلة الصحيحة للألباني ژمارە : ٢٢٣٧.

واته پیتی ئەلیف پیتی درێژکردنەوە (المدّ)و، ئاسان (اللین)یشە، چونکە هەمیشە زەنندەرەو پێشەوەی سەری هەیە، بەلاّم هەردوو پیتی (و، ي) پیتی درێژکردنەوە (المدّ)ن کاتێك زەنندەاربن‌و (حرکة)ی پێشەوەیان لە ڕەگەزی خۆیان بێت، پیتی ئاسان (اللین)یشن کاتێك زەنندەاربن و پێشەوەیان (مفتوح) بێت.[١٥٠]

(الجمزوري) دەڵێت:

حُرُوفُهُ ثَلاَثَةٌ فَعِيـــــــــــــهَا مِنْ لَفْظِ وَايٍ وَهْيَ فِي نُوحِيهَا

وَالكَسْرُ قَبْلَ الْيَا وَقَبْلَ الْواوِ ضَمْ شَرْطٌ وَفَتْحٌ قَبْلَ أَلْفٍ يُلْتَـزَمْ

وَاللِّينُ مِنْهَا الْيَا وَوَاوٌ سُكِّنَـــا إِنِ انْفِتَاحٌ قَبْلَ كُلٍّ أُعْلِـــنَا

## جیاوازی نێوان پیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ) پیتی هەمزە:

| ڕووی بەراورد | هەمزە | پیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ) |
|---|---|---|
| لەڕووی جێدەنگەوە | دوورترینی گەرووە. | بۆشایی (جوف) |
| لەڕووی توندی (الشدة)و نەرمی (الرّخاوة) | بەهێزە (شدید). | نەرمن (رِخو) |
| لەڕووی شێوەیانەوە | بزواوو (متحرك) زەنندەارن (ساكن) | (حرکة) یان نیە |

[١٥٠] بڕوانە: أحکام تلاوة القرآن، ل٢٠٩.

**بەشەکانی درێژکردنەوە (المدّ):**

**درێژکردنەوە (المدّ) دەکرێت بەدوو بەشی سەرەکیەوە:**

**یەکەم: درێژکردنەوەی بنچینەیی (المد الأصلي)**

**دووەم: درێژکردنەوەی لاوەکی (المد الفرعي)**

**یەکەم: درێژکردنەوەی بنچینەیی (المد الأصلي):**

**بریتیە لەو درێژکردنەوە (المدّ)ەی کەبەبێ ئەو پیتەکە تەواو نابێت، بەدواید هەمزە و (سکون) نییە.**[151]

**هۆی ناونانی: بنچینەییە لەچاو درێژکردنەوە (المدّ)ەکانی تردا.**

**هەروەها پێشی دەوترێ درێژکردنەوەی ئاسایی (المد الطبيعي) چونکە هەموو دەم و زمانێکی ساغ زیاترو کەمتر لەو ئەندازەیە درێژی ناکاتەوە.**

**ئەندازەی درێژکردنەوەی: تەنها دوو جووڵە (حركة)یە.**

**(الجمزوري) دەڵێت:**

| | |
|---|---|
| وَالمَدُّ أَصْـلِيٌّ وَفَرْعِـيٌّ لَـــــــهُ | وَسَمِّ أَوَّلاً طَبِيعًيّا وَهُـــــــو |
| مَا لاَ تَوَقُّفٌ لَهُ عَلَى سَبَـــــبْ | وَلاَ بِدُونِه الْحرُوفُ تُجْـتَلَبْ |
| بَـلْ أَيْ حَرْفٍ غَيْرُ هَمْزٍ أَوْ سُكُونْ | جَا بَعْدَ مَدّ فَالطَبِيعِيُّ يَكُــونْ |

**ئەندازەی درێژکردنەوەی بنچینەیی:**

**سەبارەت بەئەندازەی درێژکردنەوەی پیتەکانی درێژکردنەوە (المدّ) زانایانی پێشین زاراوەی ئەلیفیان بەکارهێناوە، واتە: بۆ هەموو جۆرێك لەجۆرەکانی درێژکردنەوەی بنچینەیی وتوویانە ئەندازەی ئەلیفێك درێژدەکرێتەوە، زانایانی دوای ئەوانیش زاراوەی (حركة)یاخود بەکارهێناوە، (حركة)ش یەکەیەکی پێوانەییەو بریتیە لەزەمەنی دەربڕینی (فتحة)یەك یاخود (ضمّة)یەك یاخود (كسرة)یەك، هەر بۆیە بە(فتحة) یاخود وتووە ئەلیفی بچووك‌و بە(ضمّة)شیان وتووە واوی بچووك‌و بە (كسرة)شیان وتووە یای بچووك.**

---

[151] **بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٠.**

**بەلاَم پاش سەرنجدان بۆمان ڕووندەبێتەوە کە هەردوو زارەوەکە [واتە: ئەلیف‌و (حرکة)] هەمان مەبەست دەگەیەنن، چونکە مەبەست لەدوو(حرکة) واتە: (٢ضمة) یان (٢ فتحة) یان (٢ کسرة).**

**کەواتە ماوە (زمن)ی پێویست بۆ دەربڕینی ئەلیفێك یەکسانە بەماوە (زمن)ی پێویست بۆ دەربڕینی دوو جووڵە (حرکة)و هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئەم دوو زاراوەیەدا نییە.**

**بەلاَم زۆرێك لەزانایانی سەردەم دەڵێن: ئەندازەی دوو (حرکة) ئەوەندەیە کە بە خێراییەکی مامناوەند پەنجەت دابخەیت یاخود بیکەیتەوە.**

**بەلاَم ئەم قسەیە قسەیەکی ڕوون نییەو بەپێوەرێکی دروست دانانرێت‌و ئەندازەکەی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، نەگونجاویشە لەگەڵ هەرسێ شێوازی خوێندنەوە (التحقیق، التدویر، الحدر) [١٥٢]، بۆیە پێویستە لای مامۆستایەکی خاوەن مۆڵەت ئەم یاسایە فێرببیت.**

**بەشەکانی درێژکردنەوەی ئاسایی (المد الطبیعي): درێژکردنەوەی ئاسایی دەکرێت بەدوو بەشەوە: [١٥٣]**

- **درێژکردنەوەی ئاسایی وشەیی (المد الطبیعي الکلمي)**
- **درێژکردنەوەی ئاسایی پیتیی (المد الطبیعي الحرفي)**

---

[١٥٢] **بڕوانە: حق التلاوة ل ١٩٥، تیسیر الرحمن ل ٢٠٥، علم التجوید للغوثاني ل ٤٧، کیف تقرأ القرآن للدکتور أیمن رشدي سوید (وانەی ٥٣-٥٤)**

[١٥٣] **بڕوانە:هدایة القاري للمرصفي ل (١٣٣-١٣٥)، غایة المرید في علم التجوید ل: (٤٨-٤٩)، تیسیر الرحمن ل: (٢٠٦- ٢٠٧)**

- **درێژکردنەوەی ئاسایی وشەیی (المد الطبیعي الکلمي):**

**ئەم درێژکردنەوە (المدّ)ەش لە یەك وشەدا ڕوودەدات ، سێ جۆری هەیە:**

**أ- درێژکردنەوەی ئاسایی جێگیر لەکاتی گەیاندن و وەستاندا (المد الطبیعي الثابت وصلاً ووقفا):**

**ئەگەر دوای پیتی درێژکردنەوە (المدّ) پیتێکی بزواو (متحرك) لە حاڵەتی وەستان (وقف)و گەیاندن (وصل)دا هاتبێت، لەسەرەتاوە بێت یاخود لەکۆتایی.**

**وەکو:** ﴿مَٰلِكِ﴾، ﴿يُوصِيكُمُ﴾، ﴿وَضُحَىٰهَا﴾، ﴿قَالُوٓا﴾، ﴿وَأَهۡلِي﴾

**ب- درێژکردنەوەی ئاسایی جێگیر لەکاتی وەستاندا (المد الطبیعي الثابت في الوقف دون الوصل):**

**ئەمجۆرەیان تەنها لەحاڵەتی وەستان (وقف)دا بوونی هەیە، ئەویش لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:**

- **بەدوای پیتی درێژکردنەوە (المدّ)دا لە وشەیەکی تردا پیتێکی زەنندار هاتبێت، واتە (التقاء الساکنین).**

**نموونەی ئەلیف:**

﴿فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ...﴾(النساء:١٧٦) ، ﴿وَقَالَا ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ (النمل:١٥)

﴿وَجَآءَ رَجُلٞ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ﴾ (القصص:٢٠)،﴿ طَغَا ٱلۡمَآءُ﴾ (الحاقە:١١)

**نموونەی واو:**

﴿ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ ﴾ (المطففين ١٦) ، ﴿وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ﴾ (الأنفال:٣٢)

**نموونەی (یاء):**

﴿وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ﴾ (الفجر ١٠)، ﴿حَاضِرِي ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ (البقرة:١٩٦)

- **وەستان لەسەر ناوە (مقصور)ەکان:**

**وەکو:** ﴿ضُحَىً﴾، ﴿عَمًى﴾، ﴿سُدًى﴾.

- **وەستان لەسەر ناوە (منصوب)ەکان:**

وەکو: ﴿ذِكۡرًا﴾، ﴿نَفِيرًا﴾، ﴿حِمۡلاً﴾

ئەمجۆرە درێژکردنەوەی قەرەبوو (مد العِوضِ)ی پێدەگوترێت، واتە: هێنانی پیتی ئەلیف لەجیاتی (تنوین) لەحاڵەتی وەستاندا.

هەروەها وەستان لەسەر وشەی ﴿وَلَيَكُونًا﴾، ﴿لَنَسۡفَعًۢا﴾، ﴿إِذًا﴾، بە(وَلَيَكُونَا)و (لَنَسْفَعَا)و (إِذَا) دەخوێنرێتەوە.

- ئەگەر پیتی درێژکردنەوە (المدّ)ەکە پیتی ئەلیف بێت بێت ئەویش لەم (حەوت) وشەیەی خوارەوەدا:

﴿أَنَا﴾ بۆ نموونە: ﴿ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمۡ﴾ (الكافرون ٤)

﴿لَّٰكِنَّا﴾ لەئایەتی ﴿لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي ﴾ (الكهف ٣٨)

﴿ٱلظُّنُونَا﴾ لەئایەتی ﴿وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴾ (الأحزاب ١٠)

﴿ٱلرَّسُولَا﴾ لەئایەتی ﴿وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾ (الأحزاب ٦٦)

﴿ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾ لەئایەتی ﴿ فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾ (الأحزاب ٦٧)

﴿قَوَارِيرَا۠ ﴾ لەئایەتی﴿ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۠ ﴾ (الانسان ١٥)

﴿سَلَٰسِلَا۟﴾ لەئایەتی ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا۟ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا﴾ (الانسان ٤)

تێبینی:

یەکەم: لەکاتی وەستان لەسەر وشەی ﴿سَلَٰسِلَا۟﴾ دەشتوانی ئەلیفەکەی نەخوێنیتەوەو لەسەر پیتی لام بوەستی، بەڵام لەحاڵەتی گەیاندن (وصل)دا دەبێت ئەلیفەکە نەخوێنرێتەوە.[١٥٤]

دووەم: بەڵام وشەی ﴿قَوَارِيرَا۟﴾ی دووەمی سورەتی (الإنسان: ١٦) لە حاڵەتی گەیاندن و وەستاندا ئەلیفەکەی ناخوێنرێتەوە.[١٥٥]

---

[١٥٤] بڕوانە: مذكرة في أحكام التجويد (١/٢٥).

﴿وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۠ ١٥ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٖ قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرٗا﴾

سێیەم: لە (مصحف)ی پیرۆزدا سفرێکی درێژ لەسەر ئەلیفی ئەم حەوت وشەیە دانراوە، واتە نەخوێندنەوەیان لەکاتی گەیاندن (وصل)دا.[156]

ج- درێژکردنەوەی ئاسایی جێگیر تەنها لە کاتی گەیاندندا (المد الطبيعي الثابت في الوصل دون الوقف):

ئەمیش لەم دوو حاڵەتەی خوارەوەدا:

حاڵەتی یەکەم: درێژکردنەوەی ڕاناوی بچووک (الصلة الصغرى): ئەو ڕاناوە بزواوەیە کەبۆ تاکێکی ئامادە نەبووی نێر بەکاردێت و دەکەوێتە کۆتایی وشەوە لەنێوان دوو پیتی بزواودا بەمەرجێك بەدوایدا پیتی هەمزە نەیەت.

وەکو:

﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ﴾، بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە:(لَهُو كُفُوً).

﴿فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا ٤ فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا﴾ (العاديات ٤-٥) بە(بهي نقعاً)و (بِهِي جَمعاً) دەخوێنرێتەوە.

ئەندازەکەشی دوو جووڵە (حركة) درێژدەکرێتەوە لە حاڵەتی گەیاندندا.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر پیتی درێژکردنەوە (المدّ) کەوتە پێش پیتی کۆتاییەوە ئەوا دەبێتە درێژکردنەوەیەکی ئاسایی لە کاتی گەیاندندا، بەڵام لە حاڵەتی وەستاندا دەبێتە درێژکردنەوەی توشهاتوو بەزەننە (المد العارض للسكون)و دەتوانرێت دوو یاخود چوار یاخود شەش جووڵە (حركة) درێژ بکرێتەوە. وەکو: ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾، ﴿ٱلۡأَرۡذَلُونَ﴾، ﴿ٱلۡحِسَابِ﴾

---

[155] بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد ل١٠٤.

[156] بڕوانە: فتح رب البريّة ل ٦٤.

- دریژكردنه‌وه‌ی ئاسایی پیتیی (المد الطبيعي الحرفي):

ئه‌و پیتانه‌ ده‌گریته‌وه‌ له‌سه‌ره‌تای هه‌ندێ له‌سوره‌ته‌كاندا هاتوون.

پیته‌كانی: ئه‌م دریژكردنه‌وه‌ش له‌پێنج پیتدا هه‌ڵهێنراوه‌: (ح، ي، ط، ه، ر) له‌رسته‌ی (حي طهر)دا كۆكراونه‌ته‌وه‌، به‌ (حا، يا، طا، ها، را) ده‌خوینرێنه‌وه‌.

پیتی (ح) له‌وشه‌ی ﴿حمٓ﴾ی حه‌وت سوره‌تدا (غافر، فصلت، الشورى، الزخرف، الدخان، الجاثية، الأحقاف )

پیتی (ي) له‌ ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ی سوره‌تی (مريم)و، (يس).

پیتی (ط) له‌ سوره‌تی ﴿طه﴾، ﴿طسٓمٓ﴾ی سوره‌تی (الشّعراء)و (القَصَص)، ﴿طسٓ﴾ی سوره‌تی (النمل).

پیتی (ه) له‌ ﴿كٓهيعٓصٓ﴾، ﴿طه﴾

پیتی (ر) له‌ ﴿الٓر﴾ی هه‌ر پێنج سوره‌تی (يونس، هود، يوسف، إبراهيم، الحجر)و، له‌ ﴿الٓمٓر﴾ی سوره‌تی (الرَّعد).

## درێژکردنەوەی لاوەکی (المد الفرعي)و بەشەکانی:

**پێناسە:** درێژکردنەوەی پیتەکان زیاتر لە درێژکردنەوەی ئاسایی، لەبەر هۆکارێك لەهۆکارەکان.[157]

**هۆکارەکانی:** گەیشتنی پیتەکانی درێژکردنەوە بە پیتی هەمزە (ء) یاخود پیتێکی زەننەدار.

**(الجمزوري) دەڵێت:**

وَالآخَرُ الْفَرْعِيُّ مَوْقُوفٌ عَلَى سَبَبْ كَهَمْزٍ أَوْ سُكُونٍ مُسْجَلا

**ئەم درێژکردنەوەش دوو جۆرە:**

**یەکەم:** ئەو درێژکردنەوانەی بەهۆی پیتی هەمزە وە ڕوودەدەن.

**دووەم:** ئەو درێژکردنەوانەی بەهۆی پیتێکی زەننەدارەوە ڕوودەدەن.

---

[157] تیسیر الرحمن ل (٢٠٨).

**یەکەم: ئەو درێژکردنەوانەی بەهۆی هەمزە وە ڕوودەدەن:**

**ئەمیش سێ جۆرە:**

**١- درێژکردنەوەی پێویستی لکاو (المد الواجب المتصل).**

**کاتێك بەدوای یەکێك لەپیتەکانی درێژکردنەوەدا پیتی هەمزە هاتبێت لەیەك وشەدا. ئەم درێژکردنەوەیە ئەرکە، چونکە گشت قورئانخوێنان (القُرّاء) بڕیاریان لەسەر درێژکردنەوەی داوە.**

**هۆی ناونانی: لکاو (متصل) چونکە لە یەك وشەدا ڕوو دەدات.**

**ئەندازەی درێژ کردنەوەی: (٤) یاخود (٥) جووڵەیە، بەلاّم (٤) جووڵە بەناوبانگترە.**

**ئیبنولجەزەری دەڵێت:**

وَوَاجِبٌ إنْ جَاءَ قَبْلَ هَمْزَةِ مُتَّصِلاً إنْ جُمِعَا بِكِلْمَةِ

**نموونە:**

**پیتی درێژکردنەوە لە ناوەڕاستدا:** ﴿ فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا ﴾، ﴿ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ﴾، ﴿لِيَسُـُٓٔوا﴾

**پیتی درێژکردنەوە لە کۆتاییدا:** ﴿وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ ﴾، ﴿يَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾، ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ۖ ﴾

**تێبینی: ئەگەر پیتی هەمزە کەوتە کۆتایی وشەو لەسەری وەستایت دەتوانی تا (٦) جووڵە درێژی بکەیتەوە، چونکە دەبێتە درێژکردنەوەی توشهاتوو بەزەننە (العارض للسکون)، وەکو:**

﴿ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ ﴾ (الجمعة ٤)

﴿إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ (غافر ٥٨)

٢- درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا (المد الجائز المنفصل):

کاتێکە یەکێك لە پیتەکانی درێژکردنەوە لە کۆتایی وشەیەکداو پیتی هەمزە لە سەرەتای وشەیەکی تردا بەدوای ئەودا هاتبێت.

هۆی ناونانی: پێی گوتراوە جودا (منفصل) چونکە لەدوو وشەدا ڕوو دەدات. هەروەها پێی گوتراوە ڕێپێدراو (جائز) چونکە لەلای هەندێك لەقورئانخوێنان کورتکردنەوەی بۆ (٢) جووڵەش (واتە: القصر) دروستە.

ئەندازەی درێژکردنەوەی: دەتوانرێ (٤) یاخود (٥) جووڵە درێژبکرێتەوە بەڵام (٤) بەناوبانگترە.

ئیبنولجەزەری دەڵێت:

وَجَائِزٌ إِذَا أَتَى مُنْفَصِلاً ......................

نموونە:

کاتێك پیتی درێژکردنەوەکە بخوێنرێتەوەو بنوسرێت وەك:

﴿وَلَآ أَنتُمْ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ﴾ (الكافرون:٥)

﴿وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ﴾(المطففين: ٣١)

یاخود بخوێنرێتەوەو بەڵام نەنوسرابێت وەك:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، ﴿ يَـٰٓـَٔادَمُ ﴾، ﴿ يَـٰٓأَهْلَ﴾، ﴿هَـٰٓأَنتُم﴾

تێبینی: ئەم جۆرە درێژکردنەوە تەنها لەکاتی گەیاندن (وصل)دایە، خۆ ئەگەر لەسەر وشەی یەکەم وەستای لە (٢) جووڵە زیاتر درێژی ناکەیتەوە.

٣- درێژکردنەوەی لەجیاتی (مد البَدَل):[١٥٨]

بەو درێژکردنەوە دەگوترێت کە لەپێش پیتی درێژکردنەوە لەیەك وشەدا پیتی هەمزە هاتبێتو لە دوای پیتی درێژکردنەوەکەش هەمزەو زەننە نەهاتبێت.

هۆی ناونانی: ناونراوە درێژکردنەوەی لە جیاتی (مد البدل)، چونکە پیتە درێژکردنەوە (المدّ)کە لە بنچینەدا هەمزەیەکی زەنندار بووە بەپێی یاسای زانستی (الصرف) هەرکات دوو هەمزە لەسەرەتای وشەیەکدا کۆبونەوە یەکەمیان بزواو و دووەمیان زەنندارببێت، دووەمیان دەگۆڕرێت بۆ پیتی درێژکردنەوە (المدّ) لەڕەگەزی جوولەی پیتی پێش خۆی.

ئەندازەی درێژکردنەوەی: لەلای (حفص) تەنها دوو جوولە درێژدەکرێتەوە.

نموونە: ﴿ءَادَم﴾، ﴿أُوتُوا ﴾، ﴿إِيتَآء﴾ لە بنچینەدا (أَأْدم)، (أُؤْتوا)، (إِئْتاء) بوون.

درێژکردنەوەی لێکچوو بە لەجیاتی (المدُّ الشّبيهُ بالبَدَل):

هەر پیتێکی درێژکردنەوە (المدّ) بەدوای هەمزەدا هاتبێ زانایان بەپاشکۆی درێژکردنەوەی لەجیاتی (مد البدل)یان داناوەو، هەمان حوکمی درێژکردنەوەی لەجیاتی (مد البدل) وەردەگرێت، با لە بنچینەشدا هەمزە نەبووبێت.[١٥٩]

وەك: ﴿ لَيَـُٔوسٌ﴾، ﴿ يَشَآءُون﴾، ﴿ مُّتَّكِـِٔين﴾، ﴿ مَـَٔابٍ﴾

حاڵەتەکانی درێژکردنەوەی لەجیاتی (مد البدل):

١- لەگەیاندنو وەستاندا جێگیرە: ئەگەر لەسەرەتاوە یاخود لەناوەڕاستەوە هاتبوو، وەکو: ﴿ءَامَن﴾، ﴿إِي وَرَبِّيٓ﴾، ﴿أَنۢبِـُٔونِي﴾.

٢- تەنها لە گەیاندندا جێگیرە: وەکو: ﴿ٱلۡخَاطِـِٔين﴾، ﴿مُسۡتَهۡزِءُون﴾، ﴿يُرَآءُون﴾

بەڵام لەحاڵەتی وەستاندا دەبێتە درێژکردنەوەی توشهاتوو بەزەننەو (المد العارض للسكون) (٢) یاخود (٤) یاخود (٦) جوولە درێژدەکرێتەوە.

---

[١٥٨] تيسير الرحمن ل ٢١٦-٢١٧.

[١٥٩] الروضة الندية شرح متن الجزرية ل ٣٢.

٣- جێگیره تەنها لەوەستاندا: وەك: ﴿وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ﴾ ئەگەر لەسەر وشەی ﴿وَجَآءُو﴾ وەستایت دەبێتە درێژکردنەوەی لە جیاتی (البدل)و دوو جووڵە درێژدەکرێتەوە.

٤- جێگیره تەنها لەکاتی دەستپێکردندا: وەکو وشەی ﴿ٱئۡتُونِي﴾ی ئایەتی ﴿أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِۖ ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ هَٰذَآ﴾ (الأحقاف ٤) واتە لەکاتی گەیاندندا بە (السماواتِئتوني) دەخوێنرێتەوە بەبێ هەمزە.

بەڵام ئەگەر لەسەر وشەی ﴿ٱلسَّمَٰوَٰت﴾ وەستایت، پاشان دەستتکردەوە بەخوێندنی ﴿ٱئۡتُونِي﴾بە (إیتوني) دەخوێنرێتەوەو دوو جووڵە درێژدەکرێتەوەو دەبێتە درێژکردنەوەی لە جیاتی (مد البدل)، هەروەها:

﴿وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ﴾ (التوبة ٤٩)

﴿وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ﴾ (الأعراف ٧٧)

﴿فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ﴾ (البقرة: ٢٨٣ )

ئەگەر لەسەرەتاوە خوێنرایەوە بە(إیذن لي)و (إِیتِنَا)و (أوتمن) دەخوێنرێنەوە.

دووەم: ئەو درێژکردنەوانەی بەهۆی پیتێکی زەننەدارەوە ڕوودەدەن:

١- درێژکردنەوەی پاپەند (المدُّ اللازم ).

٢- درێژکردنەوەی توشهاتوو بەزەننە (المد العارض للسكون).

٣- درێژکردنەوەی ئاسان (مد اللين)

یەکەم: درێژکردنەوەی پاپەند (المدّ اللازم ).

بریتیە لە هاتنی پیتێکی زەننەداری بنچینەیی بەدوای یەکێك لەپیتەکانی درێژکردنەوەدا لەهەردوو حاڵەتی وەستانو گەیاندندا لەوشەیەکدا یاخود لەپیتێك لەپیتەکانی سەرەتای هەندێ لەسوڕەتەکاندا.[160]

هۆکاری ئەم درێژکردنەوەیە بە یەکگەیشتنی دوو پیتی زەننەدارە، کە هەردوو درێژکردنەوەو زەننەدارەکەیە، پیتی یەکەم درێژ دەکرێتەوە بۆ ئەوەی درێژکردنەوەکە وەك پیتێکی لێبێتو بکەوێتە نێوان دوو پیتە زەننەدارەکەوە.

ئەندازەی درێژکردنەوەی: پێویستە شەش جووڵە درێژبکرێتەوە.

ئیبنولجەزەری دەڵێت:

فلازِمٌ إنْ جاءَ بعْدَ حرفِ مَد ساكِنُ حَالَيْن وبالطول يُمَد.

هۆی ناونانی: سەرجەم قورئانخوێنان لەسەر تەواو درێژکردنەوەی لەهەردوو حاڵەتی وەستان و گەیاندندا یەکدەنگن.[161]

درێژکردنەوەی پاپەند (المد اللازم) دەبێت بەدوو بەشەوە:

أ- درێژکردنەوەی پابەندی وشەیی (المد اللازم الكلمي)

ب- درێژکردنەوەی پابەندی پیتیی (المد اللازم الحرفي)

هەریەك لەم دوانەش دەبن بەدوو بەشەوە:

قورسکراو (مُثقل)، سوککراو (مُخَفَّف)، (الجمزوري) لە(التحفة)دا بەم شێوەیە ئاماژەی بۆ هەرچواریانکردووە:

---

[160] تيسير الرحمن ل ٢٢١.

[161] الروضة الندية شرح متن الجزرية (٣ / ٢٥).

أَقْسَامُ لاَزِمٍ لَدَيْهِمْ أَرْبَعَهْ  وَتِلْكَ كِلْمِيٌّ وَحَرْفِيٌّ مَعَهْ
كِلاَهُمَا مُخَفَّفٌ مُثَقَّـلُ  فَهَذِهِ أَرْبَعَةٌ تُفَصَّـــــلُ

أ– درێژكردنەوەی پابەندی وشەیی (المد اللازم الكلمي):

ئەگەر بەدوای پیتی درێژكردنەوە (المدّ)دا پیتێكی زەنندداری هەمیشەیی لەهەمان وشەدا هاتبوو، ئەمیش دوو جۆرە:

* درێژكردنەوەی پابەندی وشەیی قورسكراو (المُثَّقل): ئەگەر لەدوای پیتی درێژكردنەوە (المدّ)ەوە پیتێكی (شدّة)دار هاتبوو. وەك:

﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾، ﴿ٱلْحَآقَّةُ﴾،﴿دَآبَّة﴾، ﴿ءَآلذَّكَرَيْنِ﴾، ﴿ءَآللَّهُ﴾، ﴿أَتُحَـٰٓجُّوٓنِّى﴾

پێی وتراوە وشەیی: چونكە پیتە زەننداره بنچینەییەكە بەدوای پیتی درێژكردنەوە (المدّ)و لەیەك وشەدا هاتووە. هەروەها قورسكراوە چونكە تێهەڵكێش دەكرێت.

**درێژكردنەوەی پابەندی وشەیی سووككراو (المخفّف): ئەگەر لەدوای درێژكردنەوە (المدّ)ەوە پیتێكی زەننداری بنچینەیی بێ (شدّة) هاتبوو.

نموونە: لە قورئانی پیرۆزدا تەنها وشەی ﴿ءَآلْـَٔـٰنَ﴾ هەیەو دووجار لەسورەتی (یونس)دا لەئایەتی (٥١،٩١) هاتووە. پێیوتراوە سوككراو لە بەر ڕوونەدانی تێهەڵكێش.

- **درێژکردنەوەی جیاکردنەوە (مدّ الفَرق):**[162]

**ئەگەر هەمزەی پرسیار (إستفهام) چووە سەر هەمزەی گەیاندن (الوصل)، هەمزەی گەیاندن دەبێتە پیتی درێژکردنەوە (المدّ)و پێی دەوترێ درێژکردنەوەی جیاکردنەوە(مدّ الفَرق)، واتە: جیاکردنەوەی پرسیار (إستفهام) لە هەواڵ (خبر).**

**ئەم درێژکردنەوە (المدّ)ەش جۆرێکە لە درێژکردنەوەی پابەندی وشەیی، چونکە زەنەی پاش پیتە درێژکردنەوە (المدّ)ەکە بنچینەییە، ئەم حاڵەتەش لە سێ وشەداو لە شەش شوێنی قورئانی پیرۆزدا ڕوویداوە:**

**مثقل (قورس):** ﴿ءَآلذَّكَرَيۡنِ﴾ [الأنعام: ١٤٣، ١٤٤]، ﴿ءَآللَّه﴾ [النمل: ٥٩]، [يونس: ٥٩]

**سووك (مخفّف):** ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ﴾ [يونس: ٥١، ٥٩]

**تێبینی: ئەو سێ وشەیەی سەرەوە بەئاسانکردن (التسهيل)یش دەخوێنرێنەوە، واتە: ئاسانکردنی هەمزەی دووەم لە نێوان هەمزەو ئەلیفدا بەبێ درێژکردنەوە (المدّ)، بەڵام خوێندنەوەیان بە درێژکردنەوە (المدّ) لە پێشترە.**

---

[162] **تيسير علم التجويد ل: ١٤٨- ١٤٩، المنير ل: ١٣١، كتاب الإضاءة فی بيان أصول القراءة، لا: ١٤، إحكام الأحكام في تجويد القرآن ل ٢١، المنير ل: ١٣١.**

**سوود: ئەم جورە درێژکردنەوەی ڕێگرتن (الحجز)یشی پێ دەوترێ، چونکە پیتی ئەلیف ڕێگرە لەنێوان هەمزەی پرسیارو لامی ناساندنداو لەیەکیان دوور دەخاتەوە.**

ب- درێژکردنەوەی پابەندی پیتیی (المد اللازم الحرفي):

ئەگەر بەدوای پیتی درێژکردنەوە (المدّ) یاخود ئاسان (اللين)دا (واتە: پیتی عين) پیتێکی زەنندەاری بنچینەیی هاتبوو لەیەکێك لەپیتەکانی سەرەتای هەندێك لە سورەتەکاندا، بەمەرجێك ئەو پیتە هیجاکەی لە سێ پیت کەمتر نەبێت و پیتی ناوەڕاستی پیتی درێژکردنەوە (المدّ) بێت، ئەمیش دوو جۆرە:

*درێژکردنەوەی پابەندی پیتیی قورسکراو (المُثقّل): ئەگەر دوای پیتی درێژکردنەوە (المدّ) پیتێکی تێهەڵکێشکراو (مدغم) هاتبێ. وەك: ﴿الٓمٓ﴾، ﴿طسٓمٓ ﴾

پێی وتراوە: پیتیی، چونکە پیتە زەنندەارە بنچینەییەکە بەدوای پیتی درێژکردنەوە (المدّ)دا لەیەك وشەدا هاتووە. قورسکراویشە، چونکە تێهەڵکێش دەبێت.

** درێژکردنەوەی پابەندی پیتیی سووك (المُخفَّف): ئەگەر دوای پیتی درێژکردنەوە (المدّ) پیتێکی زەنندەاری تێهەڵکێش نەکراو هاتبێ. وەك: ﴿قٓ ﴾، ﴿يسٓ ﴾

پێی وتراوە: سوککراو لەبەر ڕوونەدانی تێهەڵکێش .

(الجمزوري) لەمەتنەکەیدا دەڵێت:

فَإِنْ بِكِلْمَةٍ سُكُونٌ اجْتَمَعْ مَعْ حَرْفِ مَدٍّ فَهْوَ كِلْمِيٌّ وَقَعْ
أَوْ فِي ثُلاَثِيِّ الحُرُوفِ وُجِدَا وَالمَدُّ وَسْطُهُ فَحَرْفِيٌّ بَـدَا
كِلاَهُمَا مُثَقَّلٌ إِنْ أُدْغِمَا مَخَفَّفٌ كُلٌّ إِذَا لَمْ يُدْغَمَا

**پیتە بچڕاوەکان (الحروف المقطعة)ی سەرەتای سوڕەتەکان** [163]

**ئەم پیتانە ژمارەیان چواردە پیتە[164] (الجمزوري) لەم دێڕەدا کۆیکردوونەتەوە:**

وَيَجْمَعُ الْفَوَاتِحِ ٱلارْبَعْ عَـشَرْ (صِلْهُ سُحَيْراً مَنْ قَطَعْكَ) ذَا اشْتَهَرْ.

**هەندێکی تر لە زانایان لەڕستەی (نصٌّ حكيمٌ قاطعٌ له سرٌّ).**

**ئەم (١٤) پیتە لە سەرەتای (٢٩) سوڕەتدا هاتوون و، دەکرێن بەپێنج بەشەوە:**

١- **یەك پیتیی: لە(٣) سوڕەتدا :** ﴿صٓ﴾، ﴿قٓ﴾، ﴿نٓ﴾.

٢- **دوو پیتیی: لە(١٠) سوڕەتدا:** ﴿طه﴾، ﴿طسٓ﴾ [النمل]، ﴿يسٓ﴾ ﴿حمٓ﴾ **لە (٧) سوڕەتدا: [غافر، فصّلت، الشورى، الزخرف، الدخان، الجاثية، الأحقاف].**

٣- **سێ پیتیی: لە(١٣) سوڕەتدا:** ﴿الٓمٓ﴾ **لەسوڕەتی (البقرة)، (آل عمران)، (العنكبوت)، (الرّوم)، (لقمان)، (السَّجدة)دا.**

﴿الٓر﴾ **لە سوڕەتی (يُونُس)، (هود)، (يُوسُف)، (إبراهيم)، (الحِجر)دا.**

﴿طسٓمٓ﴾ **لە سوڕەتی (الشُّعراء)، (القَصَص)دا.**

٤- **چوار پیتی: لەدوو سوڕەتدا:** ﴿الٓمٓصٓ﴾ **الأعراف،** ﴿الٓمٓر﴾ **الرَّعد.**

٥- **پێنج پیتیی: لەدوو سوڕەتدا:** ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ **مريم،**﴿حمٓ ۝١ عٓسٓقٓ﴾ **الشورى.**

**حوکمیان: ئەم چواردە پیتە لە ڕووی حوکمیشەوە دەبن بەچوار بەشەوە:**

١- **تێرکردن (الإشباع) واتە پێویستە (٦) جووڵە درێژ بکرێنەوە:**

**ئەو سێ پیتیانەن کە ناوەڕاستیان پیتی درێژکردنەوە (المدّ)ەو بە دوایاندا زەننەی بنچینەیی هاتووە، ژمارەیان (حەوت) پیتەو لەم ڕستەیەدا کۆکراونەتەوە: (سنقص لكم)، بەم شێوەیە دەخوێنرێنەوە : سين، نون، قاف، صاد، لام، كاف، ميم.**

[163] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن ل: ٢٢٤، غاية المريد ل: ١١١، تيسير الرحمن ل ٢٢٥-٢٢٦.

[164] بەچواردە شێوەش لەقەرئانی پیرۆزدا هاتوون!

٢- تێركردن (الإشباع)و، ناوەند (التوسط):

ئەو سێ پیتیانەن ناوەڕاستیان پیتی (لین)ە، ئەویش تەنها پیتی (ع: عین)ەو، لە سەرەتای سوڕەتی مریم ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ و لە سەرەتای سوڕەتی الشورى ﴿حمٓ ۝١ عٓسٓقٓ﴾دا هاتووە.

دەتوانرێ (٦) جووڵە درێژبكرێنەوە، چونكە درێژكردنەوەی پابەندی پیتیی سووكە، دەتوانرێ (٤) جووڵە درێژبكرێنەوەو وەكو درێژكردنەوەی ئاسان (اللين)ی لێبكرێت، بەڵام پێی ناوترێ درێژكردنەوەی ئاسان (اللين)، چونكە بەدوایدا زەنەنەی بنچینەیی هەیەو درێژكردنەوەی ئاسان (اللين)یش بەدوایدا زەنەنەی كاتی هەیە، بۆیە هەندێ لەزانایان ناوی ئاسانی پاپەند (اللين اللازم)یان لێناوە. بەڵام لە كاتی خوێندنەوەیدا تێركردن (الإشباع) واتە: تەواو درێژكردنەوە لەپێشترە.

٣- درێژكرنەوەی ئاسایی: ئەوانەن كە لە دووپیت پێكهاتوون، بەڵام پیتی دووەمیان پیتی درێژكردنەوە (المدّ)ەو، ژمارەیان (٥) پیتە لەڕستەی (حيّ طهر)دا كۆ كراونەتەوەو، بە (حا، يا، طا، ها، را) دەخوێنرێنەوە.

٤- بە هیچ شێوەیەك درێژناكرێنەوە: ئەوەیە كە لە (٣) پیت پێكهاتووەو ناوەڕاستی پیتی درێژكردنەوە (المدُّ)و، ئاسان (اللين) نییە، ئەمیش تەنها پیتی ئەلیف دەگرێتەوە.

**دووەم: درێژکردنەوەی توشهاتوو بەزەننە (المد العارض للسكون):**

**ئەگەر بەدوای پیتی درێژکردنەوە (المدّ)دا پیتێکی زەنندار بەهۆی وەستان (وقف)ەوە هاتبوو، واتە لە بنچینەدا زەنندار نییە.**

**ئەندازەی درێژکردنەوەی: (٢) یاخود (٤) یاخود (٦) جووڵە درێژدەکرێتەوە.**

**نموونە:**

﴿وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ﴾ (الفجر:١٠)، ﴿كَلَّا بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ﴾ (الانفطار:٩)

﴿يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ﴾ (البينة:١٢)، ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ﴾ (آل عمران ١٤)

﴿إِنَّ فِرۡعَوۡنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُواْ خَـٰطِـِٔينَ﴾ (القصص ٨)

﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ﴾ (الماعون ٦)

**سێیەم: درێژکردنەوەی ئاسان (اللين):**

**بریتیە لەپیتی (و، ي)ی زەنندار پێشەوەیان سەر (فتحة) بێت و دوایان پیتێکی زەننداری کاتی بێت بەهۆی وەستانەوە.**

**هۆی ناونانی: لەبەر ئاساندەربڕینی پیتەکانی.**

**ئەندازەی درێژکردنەوەی: (٢) یاخود (٤) یاخود (٦) جووڵە درێژدەکرێتەوە**

**نموونە :**﴿قُرَيۡش﴾ ، ﴿عَلَيۡه﴾، ﴿خَوۡف﴾

▪ درێژکردنەوەی گەیاندن (مدُّ الصِّلة):

بریتیە لە (ـە)ی ڕاناو کە بۆ کەسی سێیەمی تاکی نێر بەکاردێت. بەناو وکردارو پیتەوە دەلکێت، وەکو: ﴿قُلْتُهُۥ﴾، ﴿حَرِّقُوهُ﴾، ﴿أَجَلِهِۦ﴾، ﴿كَمِثْلِهِۦ﴾، ﴿إِلَيْهِ﴾، ﴿فِيهِ﴾.

هۆی ناونانی: چونکە تەنها لەکاتی گەیاندن (صلة)دا دەخوێنرێتەوە.

مەرجی: ئەم ڕاناوە دەبێت لە نێوان دوو پیتی بزواودا بێت.

ئەم ڕاناوە لە بنچینەدا (مبني على الضمّ)ە، بەڵام ئەگەر (كسرة) یاخود (ي) زەنندار کەوتە پێشیەوە (مكسور) دەبێت، تەنها لەدوو شوێندا نەبێت لە ریوایەتی (حفص)دا:

﴿وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ﴾ (الكهف:٦٣)، ﴿عَلَيْهُ ٱللَّهَ﴾ (الفتح: ١٠)

ئەم درێژکردنەوەیە دەکرێت بەدوو بەشەوە:

١- درێژکردنەوەی گەیاندنی بچووك (مد الصلة الصغرى): ئەگەر پیتی هەمزەی بەدواوە نەبوو، ئەوە وەك درێژکردنەوەی ئاسایی (طبيعي)یەو دوو جووڵە درێژدەکرێتەوە، واتە ئەگەر ژێری هەبوو ئەندازەی پیتی (ي)، ئەگەر بۆری هەبوو ئەندازەی پیتی (و) درێژدەکرێتەوە. لە (مصحف)دا لەدوای ڕاناوەکەوە واوێکی بچووك یاخود یایەکی بچووکی بۆ دانراوە، وەکو: ﴿إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ﴾

٢ – درێژکردنەوەی گەیاندنی گەورە (الصلة الكبرى): ئەگەر پیتی هەمزەی بەدواوە بوو.

ئەندازەی درێژکردنەوەی: وەك درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا (الجائز المنفصل) وایە (٤) یاخود (٥) جووڵە درێژدەکرێتەوە، هەر لە بەرئەوەش پێی وتراوە: (الإنفصال الحُكمي).

نموونە: ﴿وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ﴾ (الليل ١١)، ﴿أَيَحْسَبُ أَن لَّمْ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ﴾ (البلد ٧)

﴿وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ﴾ (المطففين ١٢)

سوود: (ـه)ی ڕاناو لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا درێژ ناکرێتەوە:

أ- ئەگەر کەوتە نێوان دووپیتی زەنندارەوە، وەکو:

﴿وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ﴾ (البلد ١٠)، ﴿وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ﴾ (البقرة: ١٩٧)

ب- ئەگەر پێشەوەی بزواو (متحرك) و دواوەی زەننەبوو، وەکو:

﴿فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ﴾ (الغاشية: ٢٤)

ج- ئەگەر پێشەوەی زەنندارو دواوەی بزواو بوو، وەکو:

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ﴾ (القدر: ١)

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ (النور: ٥٢)

تێبینی:

١- لە سێ شوێنی قورئانی پیرۆزدا (ـه)ی ڕاناو کەوتۆتە نێوان دوو پیتی بزواو بەڵام درێژ ناکرێتەوە، واتە بەبێ درێژکردنەوەی گەیاندن (مد الصلة) دەخوێنرێتەوە:

﴿ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾ (الزمر: ٧)

﴿ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ﴾ (النمل: ٢٨)

﴿قَالُوٓاْ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ ﴾ (الأعراف: ١١١)، (الشعراء:٣٦)

٢- لە یەك شوێنی قورئانی پیرۆزدا (ـه)ی ڕاناو پێشەوەی زەنندارو دواوەی بزواوەو دوو جووڵەش درێژ دەکرێتەوە:

﴿وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا﴾ (الفرقان ٦٩)، لە لای (حفص) بە(فيهي مُهانا) دەخوێنرێتەوە.

٣- (ـه)ی (إسم الإشارة) هەر چەندە ڕاناو نییە، بەڵام هەمان حوکمی (ـه)ی ڕاناوی هەیە، پێشەوا (ابن برّي) دەڵێت:

وهاءُ هذهِ كهاءِ المُضْمَرِ فوَصْلُهَا قبل مُحَرَّكٍ حَرِي.

﴿إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ﴾ (الانسان ٢٩)، **دوو جووڵە درێژدەکرێتەوە، چونکە پیتی هەمزە لەدوایەوە نەهاتووە .**

﴿وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ (المؤمنون ٥٢)، **(٤) یاخود (٥) جووڵە درێژدەکرێتەوە چونکە بەدوایدا پیتی هەمزە هاتووە.**

﴿هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ (الطور ١٤)، **لێرەدا هیچ درێژناکرێتەوە چونکە دواوەی پیتێکی زەنندارە.**

- درێژكردنەوەی جێگیركردن (مدُّ التمكين):

لەكاتی گەیشتنی واوێكی درێژكردنەوە بەواوێكی بزواو، یاخود یایەكی درێژكردنەوە بە یایەكی بزواو ڕوودەدات و، سێ شێوەی هەیە:

١- یای درێژكردنەوە بەدوای یایەكی (شدة)داردا هاتبێت، وەك: ﴿ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾، ﴿عِلِّيِّينَ﴾، ﴿ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ﴾، ﴿حُيِّيتُم﴾ بۆیە پێیتە درێژكردنەوە (المدّ)ەكە پێویستی بە جێگیركردن و ڕوونكردنەوەیە.

٢- واوی درێژكردنەوە پێش واوێكی بزواو هاتبێت، وەك: ﴿ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ﴾، یاخود یایەكی درێژكردنەوە پێش یایەكی بزواو كەوتبێت، وەك: ﴿فِي يَوۡمَيۡنِ﴾، هەر بۆیە پێویستە هەردوو پیتی واو و یا لێرەدا بەئەندازەی دوو جووڵە دریژبكرێنەوە تاوە كو پارێزراوبن لەتێهەڵكێش یاخود كەوتن.

٣- واوی درێژكردنەوە بەدوای واوێكی بۆردار (مضموم)دا هاتبێت، وەك: ﴿يَلۡوُۥنَ﴾، ﴿تُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾، لێرەشدا پێویستە ئەو درێژكردنەوە (المدّ)ە ماڤی بدرێت و دوو جووڵە درێژبكرێتەوە.

تێبینی: ئەم درێژكردنەوەیە (المدّ) پێویستە دوو جووڵە درێژبكرێتەوە بەڵام لەكاتی وەستان لەسەر ﴿ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ و هاوشێوەكانی دەبنە درێژكردنەوەی (العارض للسكون)و دەتوانرێ بەئەندازەی (٢) یاخود (٤) یاخود (٦) جووڵە درێژبكرێتەوە.[١٦٥]

---

[١٦٥] الإضاءة في بيان أصول القراءة ل: ١٤، المنير ل: ١١٩.

▪ درێژکردنەوەی قەرەبوو (مدُّ العوض):

بریتیە لەوەستان لەسەر (تنوین)ێکی (منصوب) لە کۆتایی وشەدا، بەئەلیفێکی درێژکردنەوە، واتە پیتی ئەلیفەکە لە جیاتی (تنوین)ەکە.

ئەندازەی درێژکردنەوەی: پێویستە (٢) جووڵە درێژ بکرێتەوە.

نموونە: ﴿بَصِيرًا﴾، ﴿كَبِيرًا﴾، ﴿بِنَآءً﴾، ﴿مَآءً﴾، ﴿لَنَسْفَعًا﴾، ﴿وَلَيَكُونًا﴾.

تێبینی: (ت)ی (تأنیث)ی خڕ (مربوطة) ئەگەر (تنوین)ی (فتحة)ی هەبوو بەپیتی (ـە) لەسەری دەوەستی. نموونە :﴿ رحمةً، نِعمةً ﴾.[١٦٦]

ڕیزبەندی درێژکردنەوە لاوەکیەکان:[١٦٧]

درێژکردنەوە (المدّ)ە لاوەکیەکان لە ڕووی بەهێزیو لاوازیەوە بەپێی جیاوازی هۆکارەکانیان جیاوازن، واتە ئەگەر هۆکاری دروستبوونی درێژکردنەوە (المدّ)ەکە بەهێز بوو درێژکردنەوە (المدّ)ەکەش بەهێزە، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر هۆکارەکەی لاوازبوو درێژکردنەوە (المدّ)ەکەش لاواز دەبێت، ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- بەهێزترینیان درێژکردنەوەی پابەند (اللازم).
٢- درێژکردنەوەی لکاو (المتصل).
٣- درێژکردنەوەی تووشهاتو بەزەننە (العارض للسكون).
٤- درێژکردنەوەی جیا (المنفصل).
٥- درێژکردنەوەی لەجیاتی (البدل).
٦- لاوازترینیان درێژکردنەوەی ئاسان (اللين)ە.

کەواتە ئەگەر لەوشەیەکدا دوو هۆکار لەهۆکارەکانی درێژکردنەوە (المدّ) کۆبوونەوە کار بەهۆکارە بەهێزەکەیان دەکرێت، بۆ وێنە: ﴿وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ﴾ وشەی ﴿ءَآمِّينَ﴾ دوو هۆکاری درێژکردنەوەی تێدایە، یەکەمیان درێژکردنەوەی لەجیاتی (البدل)ە چونکە پیتی هەمزە پێش پیتی درێژکردنەوە (المدّ) کەوتووە.

[١٦٦] مذكرة في التجويد ل ١٥، المنير ل ١٢١.

[١٦٧] بڕوانە: فتح رب البرية شرح المقدمة الجزرية ل: ٣٧، تيسير الرحمن ل: (٢٢٦-٢٣٠).

**دووەمیان درێژکردنەوەی پابەند (اللازم)ە چونکە پیتێکی زەنندەداری بنچینەیی بەدوای پیتی درێژکردنەوەی هاتووە، لێرەدا کار بەلاوازەکە ناکرێت کە درێژکردنەوەی لەجیاتی (البدل)ە، بەڵکو کار بەهۆکارە بەهێزەکە دەکرێت کە درێژکردنەوە (المدّ)ە پابەند (لازم)ەکەیە.**

﴿بُرَءَٰٓؤُا﴾ **لێرەشدا دوو جۆر درێژکردنەوە (المدّ) هەیە، لە جیاتی (البدل)و پێویستی لکاو (واجب متصل)، بۆیە کار بەپێویستە لکاوەکە دەکرێت، لەبەر لاوازیی لەجیاتی (البدل)ەکە فەرامۆشدەکرێت.**

**(السّمنودي) دەڵێت:**

أَقْوَى المُدودِ لازمٌ فَمَا اتَّصَلْ فَعَارِضٌ فَذُو انْفِصَالٍ فَبَدَلْ

وَسَـــــبَبَا مَدٍّ إذا مَا وُجِدَا فَإِنَّ أَقْوَى السَّبَبَيْنِ انْفَـرَدَا

**ئیبنولجەزەریش بەم نیو دێرە ئاماژەی پێکردووە:**

.................... وأقْوَى السَّبَبَيْن يَسْتَقِلْ.

**تێبینی: لەکاتی خوێندنی قورئانی پیرۆزدا پێویستە درێژکردنەوە (المدّ) هاوشێوەکان وەك یەك درێژ بکرێنەوە، بۆ نموونە درێژکردنەوەی (الجائز المنفصل) ئەگەر یەکەمیان (٤) جووڵە بوو دەبێت تا کۆتایی خوێندنەکە لەسەر (٤) جووڵە بەردەوامبیت، هەروەها درێژکردنەوەی توشهاتوو بەزەنندەش دەبێت لەسەر(٢) یاخود (٤) یاخود (٦) جووڵە تا کۆتایی خوێندنەکە لە سەری بەردەوامبیت.**[١٦٨]

**ئیبنولجەزەری لەمبارەیەوە دەڵێت:**

.................... واللَّفْظُ في نظِيرِهِ كَمِثْلِهِ

[١٦٨] **بڕوانە : هدایة القاري ل ١٤٢.**

## بەشی نۆیەم

## وەستان و دەستپێکردن (الوقف والابتداء)

وەستان و دەستپێکردن بە یەکێك لەبەشە هەرە گرنگەکانی زانستی تەجوید دادەنرێت، چونکە بەهۆیەوە واتاو مەبەستی ئایەتەکان بۆ خوێنەرو بیسەر ڕووندەبێتەوە.

**بەڵگە:**

١- ﴿وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا﴾ (المزمل: ٤) پێشەوا عەلی لەڕاڤەی ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: الترتيل: تجويد الحروف، ومعرفة الوقوف.[169] واتە: چاك خوێندنەوەی پیتەکان و زانینی وەستانەکانە.

٢- سەبارەت بە چۆنێتی قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا پرسیار کرا لە (أمّ سلمة) -خوای لێ ڕازیبێت- ئەویش فەرمووی: كان يقطع قراءته آيةً آيةً ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ثم يقف، ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ثم يقف.[170] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کۆتایی ئایەتەکاندا دەوەستا، ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ی دەخوێند پاشان دەوەستا، ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ی دەخوێندو پاشان دەوەستا.

ئیبنولجەزەریش دەڵێت:

وَبَعْدَ تَجْوِيْدِكَ لِلْحُرُوفِ          لاَبُدَّ مِنْ مَعْرِفَةِ الْوُقوفِ

والإبتداءِ .............          ......................

---

[169] النشر في القراءات العشر ل: (١/٢٣٥، ٢٥٣)، الإتقان في علوم القرآن للسيوطي (١/٢٢١).

[170] بڕوانە ل: ٢٧.

## یەکەم - وەستان (الوقف)

پێناسەی وەستان بریتیە لە بچڕاندنی دەنگو وەستان لە سەر کۆتایی وشەیەك بۆ ماوەیەکی کەم تێیدا هەناسە وەردەگرێت و نیازی دەستپێکردنەوەی هەیە.

بەشەکانی وەستان (الوقف): وەستان دەکرێت بە (چوار) بەشی سەرەکیەوە:

١- وەستانی ناچاری (الوقف الإضطراري):

بریتیە لەوەستانی خوێنەر بەهۆی هەناسە تەواوبوون یاخود هەناسە توندی یاخود پژمەو کۆکەو وەنەوزو هەرشتێکی تر لەم بابەتانە.

ئەمجۆرە وەستانەش لە هەموو کاتێکدا دروستە، بەڵام چاکتر وایە کە خوێنەر تا بۆی دەکریێ بۆ وەستانەکەی وشەی گونجاو هەڵبژێریێ. لە کاتی دەستپێکردنەوەشدا ئەگەر وشەی دوای وەستانەکە گونجاو بوو لەوێوە دەستپێدەکاتەوە گەر نا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی گونجاوە بۆ دەستپێکردنەوە.

حوکمی: ئەمجۆرە وەستانە دروستە لە بەر ناچاری.

٢- وەستانی تاقیکردنەوە (اِختباري):

وەستانە لەسەر وشەیەکی قورئانی پیرۆز کە لە بنچینەدا شوێنی وەستان نییە، بەڵکو تەنها بۆ تاقیکردنەوەو فێرکردنی قورئانخوێنە لەلایەن مامۆستاکەیەوە تا شێوازی وەستان لەسەر ئەو وشەیە فێربێت.

نموونە: وەستان لەسەر وشەی ﴿حَاضِرِی﴾ لەئایەتی: ﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمۡ يَكُنۡ أَهۡلُهُۥ حَاضِرِي ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ﴾ (البقرة:١٩٦) لە کاتی وەستاندا پێویستە پیتی یاکەی بخوێنرێتەوە، بەڵام لەکاتی گەیاندندا ناخوێنرێتەوە.

حوکمی: دروستە بەو مەرجەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو وشەیەی لەسەری وەستاوەو بیگەیەنێت بەپاش خۆی ئەگەر بۆ دەستپێکردنەوە گونجاو بوو، گەرنا دەبێت بگەڕێتەوە بۆ وشەیەك لەو وشانەی پێشتر کە گونجاون بۆ دەستپێکردنەوە.

٣- وەستانی چاوەڕوانی (الوقف الإنتظاري):

لەکاتی خوێندنەوە بە کۆکردنەوەی قیڕائات (جمع القراءات) بۆ دەرهێنانی هەموو ڕووە (وجە)کان.[١٧١]

لەم جۆرە وەستانەو ئەوەی پێشووشدا تەواوکردنی واتا بەمەرج نەگیراوە، بەڵکو قوڕئانخوێن لەهەر وشەیەکدا بیەوێ دەتوانێت بوەستێ و هەموو شێوەکان دەربهێنێ و ڕونیان بکاتەوە مەگەر وشەیەك واتا تێکبدات یاخود واتایەکی خراپ بگەیەنێت.

حوکمی: دروستەو، هەرچیەك بۆ وەستانی پێشوو وترا بۆ ئەمیش دەوترێتەوە.[١٧٢]

٤- وەستانی ئارەزوومەندانە (اِختیاري):

بریتیە لەوەستانی خوێنەر بەویستو حەزی خۆی، هەر ئەمجۆرەش لەبابەتی وەستاندا جێگای مەبەستە.

ئەمیش دەکرێت بە چوار بەشەوە[١٧٣]:

(١) وەستانی تەواوتر (تام).

(٢) وەستانی تەواو (كافي).

(٣) وەستانی باش (حسن).

(٤) وەستانی ناشیرین (قبیح).

---

[١٧١] ( د. دیاری)

[١٧٢] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن ل: ٢٥٣، تیسیر علم التجوید ل: ٢٨٧، التبیین في أحكام تلاوة الكتاب المبین ل: ٤٦٤.

[١٧٣] ئەم دابەشکردنە کاری زانایانی پاشینە وەك: (أبو عمرو الداني ت ٤٤٤ھ)، (أبو الفضل الرازي ت ٤٥٤)، (السجاوندي ت٥٣٠ھ)و، پەسەندکراوی (ابن الجزري ت ٨٣٣ ھ)یشە ڕەحمەتی خوایان لێبێت.

(١) وەستانی تەواوتر (تام)[١٧٤]: وەستانە لەسەر ڕستەیەکی تەواو کە نە لەڕووی واتاو نە لە ڕووی (إعراب)ەوە هیچ پەیوەندیەکی بەپاش خۆیەوە نییە.
حوکمەکەی: وەستان باشترە، گەیاندنیش دروستە.

نموونە:

- کۆتایی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾
- کۆتایی چیرۆك و باسەکان وەك: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ (البقرة:٥)

چونکە باسی ئیمانداران کۆتایی دێت.

بەلاّم مەرجیش نییە لە کۆتایی هەموو باسێکدا بێت، وەك: ﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ ...﴾ لێرەدا وەستان لەسەر وشەی ﴿ٱللهِ﴾ (تام)ەو باسەکەش کۆتایی نەهاتووە.

- زۆر جار دەکەوێتە کۆتایی ئایەتەکان.

جاری واش هەیە دەکەوێتە سەرەتای ئایەت وەك وەستان لەسەر ﴿وَبِٱلَّيۡلِۗ﴾ لەئایەتی ﴿وَإِنَّكُمۡ لَتَمُرُّونَ عَلَيۡهِم مُّصۡبِحِينَ ۝١٣٧ وَبِٱلَّيۡلِۗ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ [الصافات: ١٣٧،١٣٨]

هەروەها وەستان لەسەر ﴿وَزُخۡرُفٗاۚ﴾ لەئایەتی ﴿وَلِبُيُوتِهِمۡ أَبۡوَٰبٗا وَسُرُرًا عَلَيۡهَا يَتَّكِـُٔونَ ۝٣٤ وَزُخۡرُفٗاۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ [الزخرف: ٣٤، ٣٥]

- هەندێ جاریش دەکەوێتە نزیك کۆتایی ئایەت وەك وەستان لەسەر ﴿أَذِلَّةٗ﴾ لەئایەتی: ﴿قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۖ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ﴾[النمل:٣٤]

---

[١٧٤] تيسير علم التجويد ل: (٢٨٩-٢٩٥)، التبيين في أحكام تلاوة الكتاب المبين ل: (٤٦٧-٤٧٧)

• جاروباریش دەکەوێتە ناوەڕاستی ئایەتەوە وەك وەستان لەسەر ﴿وَٱلۡمِيزَانَۗ ﴾

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ﴾ [الشورى: ١٧]

نیشانەی لە (مصحف)دا: زۆر جار نیشانەی (قلی)ی بۆ دانراوە ئەگەر نەکەوتبێتە کۆتایی ئایەت[١٧٥]، لەکۆتایی ئایەتیشدا هیچ نیشانەیەکی بۆ دانەنراوە.

نیشانەکانی ناسینەوەی:

زۆر جار یەکێك لەمانەی خوارەوە بەدوایدا دێت، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم نیشانەیەم (۞) بۆ داناوە:

- پرسیار (استفهام)، وەك:

﴿ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ٦٩ ۞ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ (الحج ٦٩-٧٠)

- پیتی (یا: النداء) وەك:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ۞ ٢٠ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ (البقرة:٢٠-٢١)

- ئامرازی مەرج (شرط)، وەك: ﴿لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ ۞ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ...﴾ (النساء : ١٢٣)

- داخوازی (فعل الأمر)، وەك : ﴿ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ١١٤ وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ (هود:١١٤-١١٥)

- جیاکردنەوەی ئایەتی سزا لەئایەتی بەزەیی وەك:

﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ۞ ٢٤ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ (البقرة:٢٤-٢٥)

---

[١٧٥] (النیسابوری)یش نیشانەی (ط)ی بۆ داناوە.

- لادان لەهەواڵەوە بۆ چیرۆك وەك : ﴿وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ۝١٥٩ وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ﴾ (الأعراف: ١٦٠)

- نەرێ (النفي) ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ۝١٧٦ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ ...﴾ [البقرة: ١٧٧،١٧٨]

یاخود (النهي) ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ۝١٩٥ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ﴾ [آل عمران: ١٩٥، ١٩٦]

- لەكاتی جیاكردنەوەی دوو دژ لەیەكتر وەك: ﴿هَٰذَا هُدٗىۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن رِّجۡزٍ أَلِيمٌ﴾

- تەواوبوونی قسە (القول) وەك: ﴿إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ﴾

- دوای تەواوبوونی (إستثناء) وەك: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ۝١٦٠ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ لَعۡنَةُ ٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ﴾ [البقرة: ١٦٠، ١٦١]

**هەروەها وەستان لەسەر پیتە بچڕاوەكانی سەرەتای سورەتەكان و، كۆتایی ئایەتی فەریزەكان وەك نوێژو ڕۆژوو وزەكات و حەج و جیهادو، كۆتایی ئایەتەكانی ئەحكام وەك تەڵاق و عیددەو سوو و حەڵاڵ و حەڕام و هتد ...**

**پاشکۆی وەستانی تەواوتر (التام):**

**یەکەم: وەستانی ڕوونکردنەوە (البیان) یاخود پابەند (اللازم)[١٧٦]:**

**وەستانە لەسەر وشەیەك ئەگەر بگەیەنرێ بەوشەی دوای خۆی مانای ئایەتەکە پێچەوانە دەبێتەوە، یاخود دەیشێوێنێت.**

**حوکمی: وەستان لەسەری پێویستە.[١٧٧]**

**نیشانەی لە (مصحف)دا: زانایان بۆ ئەم جۆرە وەستانە سەرە پیتی میمیان (مـ) بە بچووکی بەنیشانە بۆ داناوەو بەمیمی خەنجەری دەناسرێت.**

**نموونە:**

﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ ۘ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ﴾ (الأنعام:٣٦)

﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ (يس:٧٦)

﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا مَثَلًا ۘ ﴾ (البقرة: ٢٦)

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ ﴾ (آل عمران: ١٨١)

﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَـٰهٍ إِلَّآ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ﴾ (المائدة: ٧٣)

﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ ۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ﴾ (الأعراف:١٨٤)

**لێرەشدا وەستان لەسەر وشەی ﴿يَتَفَكَّرُوا۟ ۗ﴾ پێویستە با لە(مصحف)یشدا نیشانەی وەستانی پێویستی بۆ دانەنرابێت، بۆ ئەوەی پیتی (ما) ببێتە (نافية)، چونکە لە تی گەیاندندا دەبێتە (موصولة)و مانای ئایەتەکە دەگۆڕێت.[١٧٨]**

---

[١٧٦] ئەشمونی لەکتێبی (منار الهدی)دا ناوی ناوە ڕوونکردنەوە (البیان)، سەجاوەندیش ناوی ناوە پابەند (اللازم)، بەڵام ناوی (البیان) گونجاوترە چونکە بەهۆی وەستانەوە ماناکەی ڕوون و ڕۆشن دەبێتەوە.

[١٧٧] مەبەست لە پابەند (اللازم) پابەندی زاراوەییە نەك شەرعی، واتە وەستان پێویستە لەبەر تەواوبوونی ماناکەی نەك ئەوەی کەهەر کەس پێی هەستێ پاداشت وەردەگرێت و ئەوەشی ئەنجامی نەدات سزا دەدرێت. بڕوانە: تیسیر علم التجوید ل: ٢٩٣، أحکام قراء القرآن ل: ٢٥٥.

[١٧٨] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ٢٩٣

﴿لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا﴾ (الفتح:٩)

هەروەها لێرەشدا وەستان لەسەر وشەی ﴿وَتُوَقِّرُوه﴾ پێویستە، بۆ جیاکردنەوەی هەردوو ڕاناوی (هاء) لەیەکتر، چونکە ڕاناوی ﴿وَتُوَقِّرُوه﴾ بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڕێتەوەو، ڕاناوی (هاء)ی ﴿وَتُسَبِّحُوه﴾ بۆ خوای گەورە دەگەڕێتەوە.[179]

دووەم: وەستانی جیبریل (وقفُ جبريل[180]): وەستان لەسەری سوننەتە، چونکە جیبریل سەلامی خوای لێبێت لەسەری وەستاوە، هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) لەکاتی وتنەوەی بەدوای جیبریلدا لەسەری وەستاوە.

ئەم وەستانەش لە (١٠) شوێنی قورئانی پیرۆزدایە :[181]

---

[179] بڕوانە: حق التلاوة ل ١٠٢- ١٠٣.

[180] وەستانی پێغەمبەریشی (وقف النبيّ) (ﷺ) پێ دوترێت.

[181] بڕوانە: هداية القاري إلى تجويد كلام الباري ل: ٣٧٦- ٣٨٢، هەروەها (١١) وەستانی تری (جبريل)ی لەسەرچاوەکانەوە هێناوەو دەڵێت هەموویان (صحيح)ن و خاوەنی (حق التلاوة) ل: ١٠٥و، (المنير)یش ل: ١٨٢، لێیەوە وەریانگرتووە کە ئەمانەن:

١- ﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ﴾ (البقره: ١٩٧)

٢- ﴿وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ﴾ (آل عمران: ٧)

٣- ﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ﴾ (المائدة: ٣٢)

٤- ﴿أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ﴾ (يونس: ٢)

٥- ﴿قُلۡ إِي وَرَبِّيٓ إِنَّهُۥ لَحَقّٞۖ﴾ (يونس: ٥٣)

٦- ﴿وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ﴾ (يونس: ٦٥)

٧- ﴿وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ﴾ (النحل: ١٠٣)

٨- ﴿وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ﴾ (لقمان: ١٣)

٩- ﴿وَكَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ (غافر: ٦)

بۆ دەستنیشانکردنی نیشانەی (۞)م بۆداناوە.

١- ﴿ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ۞ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ ﴾ (البقرة:١٤٨)

٢- ﴿قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ۞فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ (آل عمران:٩٥)

٣- ﴿وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ۞إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ (المائدة:٤٨)

٤- ﴿قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ۞ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ﴾ (المائدة:١١٦)

٥- ﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ ۞عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ ﴾ (يوسف:١٠٨)

٦- ﴿كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ۞ ﴿١٧﴾ لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ ﴾ (الرعد:١٧)

٧- ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ وَٱلْأَنْعَٰمَ ۗ خَلَقَهَا۞ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ (النحل:٤)

٨- ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ۚ۞لَّا يَسْتَوُۥنَ﴾ (السجدة:١٨)

٩- ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ ۞فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾﴾ (النازعات:٢٢-٢٣)

١٠- ﴿لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ ۞تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا﴾ (القدر:٣-٤)

---

١٠- ﴿تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ﴾ (القدر: ٤)

١١- ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ﴾ (النصر: ٣)

(٢) وەستانی تەواو (الكافي): وەستانە لەسەر ڕستەیەك لە خودی خۆیدا مانای دروست دەبەخشێت، بەڵام لە ڕووی واتاوە –نەك لە ڕووی (إعراب)ەوە– پەیوەندی بەدوای خۆیەوە ماوە.

حوكمی ئەم وەستانە: وەستان و گەیاندن وەك یەك پەسەندكراوە.

نیشانەی وەستانی (كافي): زۆر جار لە(مصحف)دا نیشانەی (ج)ی بۆ دانراوە، واتە: وەستان و نەوەستان وەك یەكن.

نموونە:

﴿أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ [البقرة: ٦]

﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾ [البقرة: ١٠]

وەستان لەسەر وشەی (الْبَيْتِ) لەئایەتی: ﴿فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ٣ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ ٤﴾ (قريش ٣–٤)

زۆرجار دەكەوێتە كۆتای ئایەتەوە وەك كۆتایی ئایەتەكانی هەر یەك لەسورەتەكانی [الجنّ، المدثّر، التكوير، الإنفطار، الإنشقاق]

نیشانەكانی وەستانی (كافي):

زۆر جار یەكێك لەمانەی خوارەوە بەدوایدا هاتووە:[182]

- (مبتدأ)، وەك: ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ١٤ ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ﴾ (البقرة:٨٥)

- كردار (فعل) وەك: ﴿وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا﴾ (المائدة:٩٥)

[182] أضواء البيان في معرفة الوقف والأبتداء ، جمال إبراهيم القِرش ل ١٥– ١٦، التبيين ل: ٤٧٩– ٤٨١.

- (مفعول به) (فعل)يْكى (محذوف) وەك: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ۝٣٠ مُنِيبِينَ إِلَيۡهِ وَٱتَّقُوهُ﴾ (الروم: ٣٠)

- (إن)ى ژێردار (مكسور): ﴿أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ جُندٌ لَّكُمۡ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ إِنِ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ﴾ (الملك: ٢١،٢٠)

- (بل): ﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلۡفُۢۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَقَلِيلٗا مَّا يُؤۡمِنُونَ﴾ (البقرة: ٨٨)

تێبینی: هەندێ جاریش وەستان لەپێش (بل)ەوە نیشانەی وەستانی باشە (الوقف الحسن).

- (لا): ﴿وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ۝٣٩ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ﴾ (يس: ٤٠)

- (سين) و (سوف): ﴿أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ﴾ (الزخرف: ١٩)

﴿قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَامِلٞۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۚ﴾ (الأنعام: ١٣٥)

- نەرێ (النفي) یان (استفهام) وەك: ﴿فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ۝٧٧ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ سِرَّهُمۡ وَنَجۡوَىٰهُمۡ﴾ (التوبة: ٧٧)

- (نعم) و (بئس) وەك: ﴿ وَوَهَبۡنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَٰنَۚ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ (ص: ٣٠)

تێبینی: له وەستانی تەواو (الوقف الكافي)دا پلەبەندی هەیە، بۆ نموونە:

﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ وەستانێکی تەواوە

﴿فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ﴾ له یەکەم تەواوترە

﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ﴾ لەهەردووکیان تەواترە.

(٣) وەستانی باش (الحسن): وەستانە لەسەر وشەیەك مانای دروست بێت، بەڵام لەڕووی ماناو (إعراب)ەوە پەیوەندی بەپاش خۆیەوە هەیە.

حوکمی ئەم وەستانە: وەستان لەسەری باش‌و دروستە بەو وشەیەی کەبەدوای وەستانەکەدا دێت دەست پێبکەیتەوە بەمەرجێك واتایەکی ناشیرین نەگەیەنێت.

وەکو: وەستان لەسەر ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ی سورەتی (الفاتحة) کەوەستانێکی باشە، بەڵام دەستپێکردن بە ﴿رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ دەستپێکرنێکی ناشیرینە.

هەروەها وەستان لەسەر وشەی ﴿ٱلرَّسُولَ﴾ باشە بەڵام دەستپێکردن بە﴿وَإِيَّاكُمْ ۙ أَن تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ ...﴾ [الممتحنة: ١] دروست نییەو دەبێتە وەستانێکی ناشیرین.

بەڵام ئەگەر کۆتایی ئایەت بوو پێویست بەگەڕانەوە ناکات، چونکە وەستان لەسەر کۆتایی ئایەتەکان سوننەتە هەروەك (أمّ سلمة) خوای لێ ڕازیبێت لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە،[١٨٣] ئەمیش بەمەرجێك پەیوەندی زۆری بەپاش خۆیەوە نەبێت گەرنا وا باشترە بگەڕێتەوە بۆ وشەیەکی گونجاو با لە کۆتایی ئایەتیشدا وەستابێت.[١٨٤]

نموونە: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْأَيَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأَخِرَةِ ۗ﴾ (البقره: ٢١٩،٢٢٠)

﴿قَالَ إِنِّيٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ ۖ﴾ (هود:٥٤، ٥٥)

---

[١٨٣] بڕوانە لاپەڕە ٢٧.

[١٨٤] بڕوانە: تیسیر علم التجوید ل: ٢٩٧-٣٠١،

**نیشانەی وەستانی باش:** زۆربەی جار لە (مصحف)دا نیشانەی (صلى)ی بۆ دانراوە، لە کاتێکدا ئەگەر دەستپێکردن بەدوای وەستانەکەوە دروستبێت.[185]

ئیبنولجەزەری سەبارەت بە هەر سێ جۆری وەستانەکان دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ..... وَهْيَ تُقْسَـــــــمُ إِذَنْ | ثَلاَثَةٌ تَامٌ وَكَافٍ وَحَسَـــــــنْ |
| وَهْيَ لِمَا تَمَّ فَإِنْ لَمْ يُوجَـدِ | تَعَلُّقٌ أَوْ كَانَ مَعْنًى فَابْتَـــدِي |
| فَالتَّامُ فَالْكَافِي وَلَفْظًا فَامْنَعَنْ | إِلَّا رُؤُوسَ الآيِ جَوِّزْ فَالْحَسَنْ |

**سوود: وەستانی چاودێری (وقف المراقبة)[186]:** بریتیە لە کۆبونەوەی دوو شوێنی گونجاو بۆ وەستان ئەگەر لە شوێنێکیاندا وەستا نابێت لەوی تریاندا بوەستێت بۆ ئەوەی واتاکە تێك نەچێت.

**حوکمی:** دروستە لە یەکێکیاندا بوەستێت، دەشتوانێت لە هیچیاندا نەوەستێت.

**هۆی ناونانی:** پێی دەوترێت (وقف المراقبة) چونکە قورئانخوێن لە یەکەمیاندا دەوەستێت چاودێری ئەوی تریان دەکات بۆ ئەوەی لەسەری نەوەستێت.

هەروەها (وقف التعانق)یشی پێ دەگوترێت، چونکە هەردوو وەستانەکە ئەوەندە لە یەکەوە نزیکن وەك ئەوە وایە دەستیان لەملی یەکتری کردبێت. ئەم جۆرە وەستانە لە (٣٥) ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هەڵهێنراوە، لە(١٤) شوێندا وەستانی یەکەمیان کۆتایی ئایەتە.

**نیشانەی لە (مصحف)دا:** نیشانەی ( ∴ ∴ )ی بۆ دانراوە.

**نموونە:** ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾

---

[185] بڕوانە: أضواء البيان في معرفة الوقف والأبتداء، جمال إبراهيم القِرش ل ١٨.

[186] بڕوانە: تيسير علم التجويد لا: ٣٠٢- ٣-٥، إحكام الأحكام ل ٢٦.التبيين لا: ٤٨٤-٤٨٥،

(٤) وەستانی ناشیرین (قبیح)[١٨٧]: وەستانە لە سەر وتەیەك لە خودی خۆیدا لە ڕووی وشەو ماناوە واتای تەواو نابەخشێت، لە بەر پەیوەست بوونی بە پاش خۆیەوە هەر بۆیە مانایەکی بێ مەبە
ست یاخود خراپ دەگەیەنێت.

حوکمی ئەم وەستانە: دروست نییە لە کاتی ناچاریدا نەبێت، وەك: کۆکەو پژمەو هەناسە توندی، لەم حاڵەتانەشدا پێویستە لە کاتی دەستپێکردنەوەدا بگەڕێتەوە بۆ پێش وەستانەکە بۆ ئەو شوێنەی مانایەکی دروست دەبەخشێت.

ئیبنولجەزەری دەڵێت:

وَغَيْرُ مَا تَمَّ قَبِيـحٌ وَلَهُ        الْوَقْفُ مُضْطَرًّا وَيَبْدَا قَبْلَه.

وەستانی (قبیح) چوار شێوەی هەیە:

١- دەقە پیرۆزەکە والێ دەکات کە هیچ واتایەك نەبەخشێ، وەکو :

وەستان لەسەر ﴿وَهَل أَتَىٰكَ﴾ ی ئایەتی ﴿وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴾ (طه ٩)

وەستان لەسەر ﴿ٱسۡمَ ﴾ ئایەتی ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ﴾ (الأعلى: ١)

٢- واتایەك دەبەخشێت کە پەروەردگار مەبەستی ئەو واتایە نیە، وەك وەستان لەسەر وشەی ﴿وَٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ی ئایەتی:﴿إِنَّمَا يَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسۡمَعُونَ وَٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ (الأنعام:٣٦)

یاخود وەستان لەسەر وشەی ﴿ٱلصَّلَوٰةَ﴾ی ئایەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾ (النساء ٤٣)

٣- وەستان لەسەر وشەیەك کە واتاکەی شایستە نەبێت بەخوای پەروەردگار، یاخود واتایەك بگەیەنێ کە پێچەوانەی بیرو باوەڕی ئیسلامیی بێت، وەکو وەستان لە سەر وشەی ﴿لَا يَهۡدِي﴾ لە ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَـٰسِقِينَ﴾ (المنافقون ٦)

---

[١٨٧] بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ٢٩٩- ٣٠٠، تیسیر ل: ٣٠٦- ٣٠٩، التبین ل:٥٠١- ٥٠٤.
سەجاوەندی ناوی ناوە وەستانی قەدەغە (القوف الممنوع).

هەروەها وەستان لەسەر ﴿لَا يَسۡتَحۡيِۦ﴾ لە ئایەتی: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ﴾ (الأحزاب: ٥٣)

٤- وەستانی زۆر لە خۆکردن (التعسّف): وەستانە لەسەر وشەیەك کە مانایەکی بیٚ مەبەست دەگەیەنیٚت، ئەم جۆرەش هەندیٚ لە بەناو قورئانخویٚنەکان بە ناڕەوایی لەسەری دەوەستن. نموونە:

وەستان لەسەر وشەی ﴿فَلَا جُنَاحَ﴾ وپاشان دەستپیٚکردن بە﴿عَلَيۡهِ﴾ لەئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ﴾ (البقرة:١٥٨)

وەستان لەسەر ﴿لَا تُشۡرِكۡ﴾ لەئایەتی: ﴿وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان: ١٣)

نیشانەی وەستانی ناشیرین لە (مصحف)دا: سەجاوەندی نیشانەی (لا)ی بۆ داناوە، واتە: لە سەری مەوەستە.

## دووەم: دەستپێکردن (الابتداء)

دەستپێکردن: بریتیە لە دەستپێکردنەوەی خوێندن پاش بچڕاندن یاخود وەستانو کۆتاییهێنان بە خوێندن، دەستپێکردنەوەش بە ویستی خوێنەرەو ناچاریی تێدا نییە، دەکرێت بەدوو بەشی سەرەکیەوە:

(١) دەستپێکرنی دروست (الابتداء الجائز):

دەستپێکردنە بە واتایەك لە خودی خۆیدا سەربەخۆیەو واتایەك ڕووندەکاتەوە کە پێچەوانە نییە لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە ویستوویەتی. دەبێت بەسێ بەشیشەوە:

١- دەستپێکرنی تەواوتر (الابتداء التام): دەستپێکردنێکە بە دوای وەستانی (تام)دا دێت، یاخود دەستپێکردنێکە لەڕووی (إعراب)و واتاوە هیچ پەیوەندیەکی بە پێش خۆیەوە نییە.

وەك: دەستپێکردن بە سەرەتای سورەتەکان، چیرۆکەکان، ئایەتەکانی ئەحکام، سیفاتی ئیمانداران یاخود بێباوەڕان یاخود دووڕووان، سەرەتای باسکردنی بەهەشت یاخود دۆزەخ، یاخود پاش وەستانی تەواوتر (التام)و ڕوونکردنەوە (البيان).[١٨٨]

٢- دەستپێکرنی تەواو (الإبتداء الكافي): دەستپێکردنێکە بە دوای وەستانی (كافي)دا دێت، یاخود دەستپێکردنە بە ڕستەیەك کە واتایەکی تەواو دەبەخشێت، بەڵام هەر لەڕووی واتاوە پەیوەندی بەپێش خۆیەوە هەیە، وەك:

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ﴾ (البقرة:٥)

﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ﴾ (البقرة:١٠)

٣- دەستپێکرنی باش (الابتداء الحسن): دەستپێکردنێکە بەدوای وەستانی (باش)دا دێت، یاخود دەستپێکردنە بەڕستەیەك لە ڕووی ماناو (إعراب)ەوە پەیوەندی بە پێش خۆیەوە هەیە.

---

[١٨٨] مذكرة في التجويد ل ٢٥، تيسير علم التجويد ل: ٣١٣.

وەك:

دەستپێكردن بە ﴿مِن قَبۡلُ﴾ لە ئایەتی: ﴿...وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ۝٣ مِن قَبۡلُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلۡفُرۡقَانَۗ﴾ (آل عمران: ٣-٤)

هەروەها دەستپێكردن بە ﴿مَن يَقُولُ﴾ لەئایەتی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ﴾ (البقرة:٨)

(٢) دەستپێكرنی ناشیرین (الابتداء القبيح):

دەستپێكردنە بە ڕستەیەك كە هیچ مانایەك نابەخشێ یاخود دەیشێوێنێ یاخود مانایەك دەبەخشێ كە خوای گەورە مەبەستی نییە، بۆیە پێویستە لەسەر قوڕئانخوێن خۆی لەمجۆرە دەستپێكردنانە بپارێزێت هەرچەندە بە مەبەستی خراپیشەوە نەبێت.

بۆ نموونە دەستپێكردن بە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُۘ﴾ (آل عمران: ١٨١)

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ﴾ (المائدة: ٧٣)

﴿يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ﴾ (المائدة: ٦٤)

﴿عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ﴾ (التوبة: ٣٠)

﴿ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ﴾ (التوبة: ٣٠)

## وەستان (السَّكت):

السكت: وەستان یاخود بێدەنگبوون لە سەر وشەیەکی قورئانی پیرۆز بۆ ماوەیەکی کەم (٢جووڵە) بە بێ هەناسەدان.[189]

شوێنەکانی (السّکت) لە قورئانی پیرۆزدا: لە ریوایەتی (حفص) لە (عاصم)ەوە لە ڕێگای (الشاطبية)وە چوار (سکتة)ی پێویست (واجب) هەن کە ئەمانەن:

١- وەستان (سکتة) لەسەر پیتی ئەلیفی وشەی (عِوَجَا) لەئایەتی ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ۝١ قَيِّمٗا...﴾ (الكهف١-٢) ئەمەش لەحاڵەتی گەیاندندا، ئەگینا وەستان لەسەر وشەی ﴿عِوَجَا﴾ دروستە چونکە کۆتایی ئایەتە.

٢- وەستان (سکتة) لەسەر پیتی ئەلیفی وشەی ﴿مَّرۡقَدِنَاۜ﴾ لەئایەتی: ﴿قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ (يس:٥٢)

لێرەدا وەستانی تەواو (الوقف التام)یش دروستە.

٣- وەستان (سکتة) لە سەر پیتی نونی وشەی ﴿مَنۡ﴾ لە ئایەتی:

﴿وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ﴾ (القيامة: ٢٧)

٤- وەستان (سکتة) لەسەر پیتی لامی وشەی ﴿بَلۡ﴾ لەئایەتی ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ (المطففين ١٤)

نیشانەی (سکتة)کان لە(مصحف)دا: زانایان پیتی (س) یاخود بە بچووکی لە سەر پیتی کۆتایی وشەکە بە نیشانە بۆ داناوە. پێشەوا (الشاطبي)یش بەدوو دێر ئاماژەی بۆ (سکتة)کانی (حفص) کردووە.[190]

---

[189] بڕوانە: غاية المريد في علم التجويد ل ١٢٣.

[190] بڕوانە: إبراز المعاني من حرز الأماني لأبي شامة ل (٢/٢٤٥).

وَسَكْتَةُ حَفْصٍ دُونَ قَطْعٍ لَطِيـــفَةٌ    عَلَى أَلِفِ التَّنْوِينِ فِي عِوَجاً بَـــلاَ
وَفِي نُونِ مَنْ رَاق وَمَرْقَــــدِنا وَلاَ    مِ بَلْ رَانَ وَالْبَاقُونَ لاَ سَكْتَ مُوصَلاَ

**هەروەها دوو (سكتة)ی تریش لە (حفص)ەوە ریوایەتکراوە، بەڵام پێویست (واجب) نین بەڵکو ڕێپێدراو (جائز)ن:**

**١- وەستان (سكتة)ی نێوان سورەتی (الأنفال)و (التوبة)، کە یەکێکە لەسێ شێوازی گەیاندنی ئەم دوو سورەتە بە یەکەوە، واتە: بچڕاندنی هەردووکیان، گەیاندنی هەردووکیان بە بێ وەستانو بەبێ (سكتة)، (سكتة) لە نێوانیاندا.**

**٢- وەستان (سكتة) لەسەر پیتی های وشەی (مَالِيه) لەئایەتی:** ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ۝٢٨ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ﴾ **(الحاقە: ٢٩،٢٨)**

**لێرەشدا خوێندنەوەی بە وەستان (سكتة)و بەبێ وەستان (سكتة)ش دروستە، بەڵام وەستان (سكتة)کە لە پێشترە، بەڵام ئەگەر بەبێ (سكتة) خوێنرایەوە پێویستە هەردوو پیتی (ه) تێهەڵکێش بکرێن، چونکە تێهەڵکێشی لێکچووی بچووکن.**[١٩١]

[١٩١] **بڕوانە: تیسیر الرحمن ل ٣٠٤.**

## نیشانەکانی وەستان

<u>مـ:</u> نیشانەی وەستانی پاپەند (لازم).

<u>قلي:</u> نیشانەی وەستانی تەواوی ڕەها (التام المطلق)، واتە: وەستان (وقف) چاکترە.

<u>ج:</u> نیشانەی وەستانی تەواو (الوقف الكافي)، واتە: وەستان و گەیاندن وەك یەکن).

<u>صلي:</u> نیشانەی وەستانی باش، بەڵام گەیاندن (وصل) چاکترە.

<u>لا:</u> نیشانەی وەستانی ناشیرینە، واتە: (الوقف القبيح)

<u>∴ ∴</u>: ئەگەر لەسەر یەکێك لەم دوو نیشانەیە بوەستی لەسەر ئەوی تریان ناوەستی، دەشتوانی لەسەر هیچ کامیان نەوەستی.

## وەستان لە سەر کۆتایی وشەکان

قورئانخوێن دەتوانێ بەسێ شێوە لە سەر کۆتایی وشەکانی قورئانی پیرۆز بوەستێ:[192]

١- زەنندەی ڕووت (السكون المحض): ئەم شێوەیە بنچینەیە (أصل) لە وەستاندا، چونکە عەرەب لە قسەکردندا بەزەننە (ساكن) دەستپێناکەن‌و بە بزواویش (متحرّك) کۆتایی بە قسەکردن ناهێنن.

٢- الرَّوم: دەربڕینی بەشێك لە جووڵە (حركة)ی کۆتایی وشەکە، بە شێوەیەك کەسی نزیکی گوێگر بیبیستێ و کەسی دوور نەیبیستێ. مەبەست لە جووڵە (ضمّة)و (كسرة)یەو هیچ جیاوازییەك نییە ئەگەر وشەکە (مبني) یاخود (مُعرب) بێت. زۆرێك لە زانایان دەڵێن دوو لەسەر سێی جووڵە (حركة)ی پیتەکە دەمێنێتەوە.

تێبینی: لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا (رَوم) قەدەغەیە:

أ- ئەگەر کۆتایی وشەکە سەر (فتحة) بوو.

ب- لە میمی کۆ (جمع)دا، وەك: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ﴾ تەنها بەزەننە لە سەری دەوەستیت.

ت- (هاء التأنيث) یاخود (التاء المربوطة) چونکە لە سەری بوەستی دەبێتە پیتی (ـه)، وەك: ﴿وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ﴾

ث- های ڕاناو (هاء الضمير) لە سەر ڕای بەهێزی زانایان، وەك: ﴿إِنَّهُۥ﴾، ﴿عَلَيۡهِ﴾

ج- ژێر (كسرة)ی کاتی (عارض)، وەك: ﴿أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ﴾

٣- الإشمام: کۆکردنەوەی لێو لە پاش زەنندەدارکردنی (إسكان) پیتە بۆر (ضمّة) دارەکە بەبێ دەربڕینی دەنگ، بە شێوەیەك چاوساغ دەیبینێت و نابینا نایبینێت. واتە شێوەی هەردوو لێو وەك شێوەی دەربڕینی پیتی واوی لێدێت. کەواتە (إشمام) شێوازە نەك دەنگ.

---

[192] بڕوانە: فتح رب البريّة ل ٥٨- ٥٩.

سوودی (ڕَوم)و (إشمام):[193]

ڕوونکردنەوەو دەرخستنی جووڵە (حرکة)ی بنچینەیی (أصلي) وشەکەیە بۆ بیسەر لە حاڵەتی (ڕَوم)داو، بۆ بینەریش لە حاڵەتی (إشمام)دا.

تێبینی:

یەکەم-(إشمام) حوکمی وەستان لە سەر زەننە (الوقف بالسکون)ی هەیە، هەر بۆیە لەگەڵیدا درێژکردنەوەی توشهاتوو بەزەننە (العارض للسکون) درێژدەکرێتەوە بە مەرجێ پیتی کۆتایی وشەکە بۆر (ضمة)دار بێت.

سێیەم: (ڕَوم)یش حوکمی گەیاندن (وصل)ی هەیە، بۆیە درێژکردنەوەی توشهاتوو بەزەننە (العارض للسکون) لە گەڵیدا درێژ ناکرێتەوە.[194]

دووەم: سەبارەت بەوشەی ﴿لَا تَأْمَنَّا﴾ (یوسف:١١) لەریوایەتی (حفص)دا پێویستە بە (إشمام) یاخود بە(ڕَوم) بخوێنرێتەوە، بۆیە لەسەر قوڕئانخوێن پێویستە لەدەمی مامۆستایانی شارەزاو مۆلەت پێدراوەوە فێری ببێت.[195]

چوارەم: ئەگەر کۆتایی وشەکە (تنوین)ی (ضمّة)و (کسرة) بوو لە کاتی (ڕَوم)دا (تنوین)ەکە لادەبەین و بە بەشێکی (ضمّة) یاخود (کسرة)کە لە سەری دەوەستین.[196]

ئیبنولجەزەری دەڵێت:

وَحَاذِرِ الْوَقْفَ بِكُلِّ الْحَرَكَهْ إِلاَّ إِذَا رُمْتَ فَبَعْضُ الْحَرَكَهْ
إِلاَّ بِفَتْحٍ أَوْ بِنَصْبٍ ، وَأَشِمّ إِشَارَةً بِالضَّمِّ فِي رَفْعٍ وَضَمّ.

بۆ ئاسانکردنی ئەم بابەتە - وەستان لەسەر کۆتایی وشەکان - ئەو وشانەی لەسەری دەوەسترێت لە (١٠) جۆردا هەڵهێنراون و لەم خشتەیەدا بە کورتی ڕوونکراوەتەوە[197]

---

[193] تيسير الرحمن ل ٢٣٨، أحكام قراءة القرآن للحصري ل ٢٣٦.

[194] وانەکانی د. أيمن سويد.

[195] هەمان سەرچاوە.

[196] هەمان سەرچاوە.

[197] أحكام قراءة الرآن للحصري ل: ٢٣٧- ٢٥٠، المنير في أحكام التجويد ل: ١٩٦- ٢٠٣.

| ژ | جۆر | جوڵەی پیتی کۆتایی | نموونە | شێوەکانی وەستان |
|---|---|---|---|---|
| ١ | زەنەی بنچینەیی | زەننە | فَلَا تَنْهَرْ | ١- زەنەی ڕووت |
| ٢ | بزواو لەکاتی گەیاندناو پێشەوەی پیتی درێژکردنەوە (المدّ)و ئاسان (اللین) نەبێت | سەردار (مفتوح) | هُنَالِكَ | ١- زەنەی ڕووت |
| | | ژێردار (مكسور) | رَبِّ | ١- زەنەی ڕووت<br>٢- الروم |
| | | بۆردار (مضموم) | لَهُ ٱلْحَمْدُ | ١- زەنەی ڕووت<br>٢- الروم<br>٣- الإشمام |
| ٣ | درێژکردنەوەی توشهاتوو بەزەنە یاخود ئاسان (اللین) | سەردار (مفتوح) | ٱلدِّينَ<br>ٱلْقَوْلَ | ١- زەننە لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە |
| | | ژێردار (مكسور) | مَتَابِ<br>ٱلْحُسْنَيَيْنِ | ١- زەننە لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە<br>٤- (الروم) لەگەڵ (٢) جوڵە |
| | | بۆردار (مضموم) | نَسْتَعِينُ | ١- زەننە لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە<br>٤- (الروم) لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٥- (الإشمام) لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٦- ( الإشمام) لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٧- ( الإشمام) لەگەڵ (٦) جوڵە |
| ٤ | (تنوین)دار | سەردار (مفتوح) | عَلِيمًا | ١- گۆڕینی (تنوین) بۆ ئەلیف |
| | | ژێردار (مكسور) | حَمِيدٍ | ١- زەننە لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | ٤- (الروم) لەگەڵ (٢)جوڵە |
| | | بۆردار (مضموم) | سَمِيعٌ | ١- زەننە لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە<br>٤- (الروم) لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٥- (الإشمام) لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٦- (الإشمام) لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٧- (الإشمام) لەگەڵ (٦) جوڵە |
| ٥ | درێژکردنەوەی پێویستی لکاو | سەردار (مفتوح) | شَآءَ | ١- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٥) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە |
| | | ژێردار (مكسور) | مِّنَ ٱلسَّمَآءِ | ١- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٥) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە<br>٤- (الروم) لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٥- (الروم) لەگەڵ (٥) جوڵە |
| | | بۆردار (مضموم) | يَشَآءُ | ١- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٥) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە<br>٤- (الروم) لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٥- (الروم) لەگەڵ (٥) جوڵە<br>٦- (الإشمام) لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٧- ( الإشمام) لەگەڵ (٥) جوڵە<br>٨- (الإشمام) لەگەڵ (٦) جوڵە |
| ٦ | درێژکردنەوەی پابەند (المدُّ اللازم) | سەردار (مفتوح) | صَوَآفَّ | ١- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە |
| | | ژێردار (مكسور) | مُضَآرٍّ | ١- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە<br>٢- (الروم) لەگەڵ (٦) جوڵە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | بۆردار<br>(مضموم) | وَٱلدَّوَآبُّ | ١- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە<br>٢- (الروم) لەگەڵ (٦) جوڵە<br>٣- (الإشمام) لەگەڵ (٦) جوڵە |
| ٧ | هاى ڕاناو<br>(هاء الكناية) | | قُلْتُهُۥ | ١- زەننەى ڕووت |
| | | | بِهِۦ | ١- زەننەى ڕووت |
| | | | وَمَا قَتَلُوهُ<br>رَأَوْهُ | ١- زەننە لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە |
| | | | فَأَلْقِيهِ<br>إِلَيْهِ | ١- زەننە لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە |
| | | | مِنْهُ | ١- زەننەى ڕووت<br>٢- (الرّوم)<br>٣- (الإشمام) |
| | | | عَلِمْتَهُۥ<br>دَلْوَهُۥ | ١- زەننەى ڕووت<br>٢- (الروم)<br>٣- (الإشمام) |
| | | | عَلَّمْنَهُ | ١- زەننە لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٢- زەننە لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٣- زەننە لەگەڵ (٦) جوڵە<br>٤- (الروم) لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٥- ( الإشمام) لەگەڵ (٢) جوڵە<br>٦- (الإشمام) لەگەڵ (٤) جوڵە<br>٧- (الإشمام) لەگەڵ (٦) جوڵە |
| ٨ | هاء التأنيث | | رَحْمَةً<br>وَرَحْمَةٌ | دەبێت بە هاى زەننەدار |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | رَحۡمَةٍ | |
| | | سەردار (مفتوح) | رَحۡمَتَ | ١- زەنندەی ڕووت |
| | | | رَحۡمَتِ | ١- زەنندەی ڕووت<br>٢- (الرَّوْم) |
| | | | رَحۡمَتُ | ١- زەنندەی ڕووت<br>٢- (الرَّوْم)<br>٣- (الإشمام) |
| ٩ | زەنندەی توشهاتوو بەجوولّە | | قُمِ ٱلَّيۡلَ<br>ٱشۡتَرَوُاْ<br>ٱلضَّلَٰلَةَ | ١- زەنندەی ڕووت |
| ١٠ | میمی كۆ<br>(میم الجمع) | | عَلَيۡكُمُ<br>ٱلۡغَمَامَ | ١- زەنندەی ڕووت |

## بڕین (القطع):

واته لێبوونەوەو کۆتایهێنان به قورئانخوێندنو دەستکردن به کارێکیتر. بۆیه پێویسته لەسەر قورئانخوێن لەو شوێنەدا کۆتایی بەخوێندنەکەی بێنێت که مانای تەواو دەبەخشێت، باشتر وایه خۆی پابەند نەکات بەو نیشانانەی له کۆتایی (جزء)و (حزب)و (نصف الحزب)و... هتد دانراون.

چونکه مەرج نییه ئەو نیشانانه لەو شوێنانەدا دانرابن کەمانایان تەواوبێت، بەڵکو زانایان دایانناون لەسەر بنەمای ژمارەی دێڕەکانو دابەشکردنی پیتەکان بەمەبەستی دابەشکردنی قورئانی پیرۆز بەسەر (جزء)و (حزب)و ... هتد.[198]

بۆ نموونه کۆتایی جوزئی (٤) پەیوەسته به سەرەتای جوزئی (٥) واته ئایەتی (٢٤)ی سورەتی (النساء)، چونکه تەواوکەره بۆ ئایەتی پێشوو باسی ئەو ئافرەتان دەکات که خوازبێنی کردنیان قەدەغەکراوه، بۆیه باش وایه ئەو ئایەتەشی لەگەڵدا بخوێنرێت.

هەروەها جوزئی (١٢) چاکتروایه به ئایەتی (٥٣)ی سورەتی (یوسف) کۆتایی بەخوێندنی ئەو جوزئه بهێنرێت.

جوزئی (١٩) باشتر وایه بەتەواوبوونی چیرۆکی پێغەمبەر (لوط) کۆتایی بەخوێندنەکەی بهێنێت واته ئایەتی (٥٨) نەك لەکۆتایی ئایەتی (٥٥)دا.

جوزئی (٢١)یش بەخوێندنی ئایەتی (٢٠)ی سورەتی (الأحزاب) کۆتایی به خوێندنەکەی بهێنێت.

جوزئی (٢٢)یش به خوێندنی تەواوی سورەتی (فاطر) کۆتایی بەخوێندنەکەی بهێنێت.

جوزئی (٢٤)یش به خوێندنی هەموو سورەتی (فصلت) کۆتایی بەخوێندنەکەی بهێنێت.

---

[198] دابەشـردنی قورئـانی پـیرۆز بەسـەر جوزئـو حیـزب و چـارەکدا لەسـەردەمی شـوێنکەوتوان (التـابعين)دا (نصـر)ی کـوڕی (عاصـم) بەفـەرمانی (الحجّاج)ی کـوڕی (یوسـف الثقفي) ئـەنجامی دا، لەسەدەی چوارەمی کۆچیشدا نیشانەکانی بۆ دانرا. (تيسير علم التجويد ل: ٣٢١– ٣٢٢).

جوزئی (٢٦)یش بە خوێندنی سوڕەتی (ق) کۆتایی بەخوێندنەکەی بهێنێت واتە سوڕەتی (الذاريات) بکەوێتە سەرەتای جوزئی (٢٧)

سەبارەت بە (حزب)و بەشەکانیشی نموونەکان زۆر لەوە زیاترن کەلێرەدا باسیان لێوە بکرێت.[١٩٩]

---

[١٩٩] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: تیسیر علم التجويد ل: ٣١٩- ٣٣٢، حق التلاوة ل ١٢٩-١٣٠.

## بەشی دەیەم
## چەند بابەتێك

**یەکەم – دەنگ بەرزکردنەوە (النَّبْر):**

لەزمانەوانیدا: دەنگ بەرزکردنەوەو هاواری توندە. لەزاراوەشدا: دروستکردنی فشارێکی زیادە لەسەر پیت.

**حاڵەتەکانی (النبر) لەقوئانی پیرۆزدا:**

١– لەکاتی وەستان لەسەر پیتی (شدّة)دار. وەك: ﴿مُّسْتَقِرٌّ﴾، ﴿أَضَلَّ﴾، ﴿مِنَ ٱلْمَسِّ﴾.

هۆکارەکەی: بۆ ئەوەی گوێگر هەستبکات کە پیتە (شدّة)دارەکە دوو پیتە.

بەڵام ئەم دوانەی خوارەوە ناگرێتەوە:

✓ پیتەکانی لەرینەوە (القلقلة) ئەگەر (شدّة)دار بوون: ﴿ٱلْحَجِّ﴾، ﴿ٱلْحَقُّ﴾، ﴿وَتَبَّ﴾، ﴿أَشَدُّ﴾.

ئەمانە لەرینەوە (القلقلة)یان پێدەکرێت و پەیوەندیان بە(نَبر)ەوە نییە.

✓ نون و میمی (شدّة)دار: ﴿ٱلْيَمِّ﴾، ﴿وَلَا جَآنٌّ﴾. ئەم دوو پیتەش مینگە هاوەڵایەتیان دەکات.

٢– لە کاتی وەستان لەسەر پیتی هەمزە کاتێك بە دوایدا پیتی درێژکردنەوە (المدّ) یاخود ئاسان (اللین) هاتبێت: ﴿ٱلسُّفَهَآءِ﴾، ﴿وَجِاْىٓءَ﴾، ﴿ٱلسُّوٓءَ﴾، ﴿شَىْءٍ﴾، ﴿ٱلسَّوْءِ﴾.

هۆکاری: نەفەوتانی پیتی هەمزە بەهۆی سەرقاڵبوونی دەم بەدەرکردنی پیتی درێژکردنەوە (المدّ)ەوە.

٣– درێژکردنەوە (المدّ): گواستنەوە لە پیتی درێژکردنەوە (المدّ)ەوە بۆ پیتێکی (شدّة)دار. وەك: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، ﴿وَٱلصَّٓفَّٰتِ﴾، ﴿ٱلْحَآقَّةُ﴾

هۆكاری: تیانەچوونی پیتە (شدّة)دارەكە بەهۆی سەرقاڵبوونی دەم بەدەركردنی پیتی درێژكردنەوە (المدّ)ەوە، بۆ ئەوەی گوێگر هەستبكات كە پیتە (شدّة)دارەكە دووپیتە.

تێبینی: ئەگەر پێش پیتەكانی لەرینەوە (القلقلة) پیتی درێژكردنەوەی پاپەند (المدُّ اللازم) هاتبوو ئەوا (نبر) پێویست (واجب) دەبێت. وەك:

﴿ٱلدَّوَآبِّ﴾، ﴿يُشَآقِّ﴾، ﴿حَآدَّ﴾

٤- لە كاتی كەوتنی ئەلیفی دوو كەسدا (ألف الاثنين) بە هۆی گەیشتنی دوو (ساكن) بەیەك (نبر) پێویست دەبێت، ئەگەر لەگەڵ تاك (مفرد)دا جیانەدەكرایەوە، بۆئەوەی گوێگر هەست بەپیتی ئەلیفەكە بكات، لێرەدا (نبر) تەنها لەحاڵەتی گەیاندن (وصل)دا پێویستە. وەك: ﴿ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ﴾، ﴿وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ﴾، ﴿وَقَالَا ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾. بەڵام ئەگەر لە تاك (مفرد) جیاكرایەوە ئەوا پێویستی بە (نبر) نابێت، وەك: ﴿دَّعَوَا ٱللَّهَ﴾، ﴿ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ﴾.

٥- لە كاتی دەربڕینی پیتی (و)و (ي) (شدة)داردا، لە حاڵەتی وەستانو گەیاندن وەك: ﴿تَوَّابًا﴾، ﴿نَبِيًّا﴾ ﴿عَصَواْ وَّكَانُواْ﴾، ﴿عَدُوٌّ﴾، ﴿ٱلنَّبِيُّ﴾

هۆكاری: تێكەڵنەبوونی (و)و (ي) (شدة)دار لەگەڵ (و)و (ي) درێژكردنەوە (المدُّ)و، ئاسان (اللين)دا.[٢٠٠]

[٢٠٠] بڕوانە: مذكرة في أحكام التجويد ل ٢٦، فتح رب البرية شرح المقدمة الجزرية ل ٦٤- ٦٥

دووەم: چەند زانیاریەك سەبارەت بە ریوایەتی (حفص) لە ڕێگای (الشاطبیة)وە:[201]

١- دەبێت درێژکردنەوەی پێویستی لکاوو درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا (٤) یاخود (٥) جووڵە دریژبکرێنەوە، بەڵام (٤) جووڵە لەپێشترە.[202]

٢- ﴿وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ [البقرة: ٢٤٥]، ﴿وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗۖ﴾ [الأعراف: ٦٩] تەنها بە پیتی (سین) دەخوێنرێنەوە.[203]

﴿أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَۜيۡطِرُونَ﴾[الطور: ٣٧] بە پیتی (صاد) و بە پیتی (سین)یش دەخوێنرێتەوە، بەڵام خوێندنەوەی بە (صاد) لەپێشترە.[204]

﴿لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ﴾ [الغاشیة: ٢٢] تەنها بە پیتی (صاد) دەخوێنرێتەوە.[205]

٣- لە کاتی گەیاندنی ئایەتی یەکەم بە دووەم لە سورەتی (آل عمران)دا پیتی (م) سەر (فتحة) وەردەگرێت لە بەر گەیشتنی دوو زەننە بەیەك (التقاء الساکنین)، ئینجا بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە:

أ- تەواو درێژکردنەوەی (میـــمَ) واتە: (٦) جووڵە درێژدەکرێتەوە.

ب- کورتکردنەوەی (میمَ) واتە: (٢) جووڵە درێژدەکرێتەوە.

بەڵام شێوەی یەکەم لەپێشترە.[206]

٤- وشەی ﴿ءَآلذَّكَرَيۡنِ﴾ [الأنعام: ١٤٣،١٤٤]و، ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ﴾[یونس:٥١،٥٩]و، ﴿ءَآللَّهُ﴾ [یونس: ٥٩، النمل: ٥٩] بە دوو شێوە دەخوێنرێنەوە:

أ- تەواو درێژکردنەوە (الإشباع).

ب- (التسهیل)، بەڵام شێوەی یەکەم لەپێشترە .[207]

---

[201] هەندێکیان پێشتر باسیان لێوەکراوە، بەڵام لەبەر گرنگیان لێرەدا تەنها ئاماژەی بۆ دەکەمەوە.

[202] المنیر في أحکام التجوید ل:٢٦٠

[203] البدور الزاهرة في القراءات العشر المتواترة ل: ٩٨، ٢٢٢

[204] هدایة القاري إلی کلاm الباري ل: ٣٢١

[205] البدور الزاهرة في القراءات العشر المتواترة ل: ٦٥٨

[206] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل: ١١١

٥- شێوەکانی خوێندنی نێوان سورەتی (الأنفال) و(التوبة) سیانن:

أ- وەستان بە هەناسەوە لەسەر ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌۢ﴾و پاشان خوێندنی ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ...﴾ بە بێ (بَسملة).

ب- گەیاندنی هەردووکیان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌۢ بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ...﴾

ت- وەستان بە بێ هەناسە (السَّکت) لەسەر وشەی ﴿عَلِيم﴾ پاشان خوێندنی ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ ...﴾.[208]

٦- وشەی ﴿مَجۡرٜىٰهَا﴾ لە ئایەتی ﴿وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ﴾ [هود:٤١] بە لارکردنەوە (الإمالة) واتە بە(ێ) دەخوێنرێتەوە.[209]

٧- تێهەڵکێشکردنی پیتی (ب) لە(م)دا لەئایەتی ﴿يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا﴾[هود:٤٢][210]

٨- ﴿لَا تَأۡمَ۫نَّا﴾ لە ئایەتی ﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ﴾ [يوسف:١١] بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە، یەکەمیان لەپێشترە:

أ- (الرّوم): واتە وشەکە بەدوو نون دەخوێنرێتەوە (تأمَنُنَا) یەکەمیان بە بۆر (ضمّة)و دووەمیان بە سەر (فتحة)، بەڵام نونە بۆردارەکە بە خێرایی (إختلاس) دەخوێنرێتەوە چونکە لەگەڵ نونی دووەمدا تێهەڵکێش نابێت، زانایان دەڵێن نونە بۆردارەکە (مضموم) دوو لەسەر سێی دەمێنێتەوە.

ب- (الإشمام): کۆکردنەوەو خڕکردنی لێو لە پاش زەنەدارکردنی (تسکین) پیتە بۆردارەکە (مضموم) بە مەبەستی ئاماژەکردن بۆ (ضمّة)کە، چونکە نونی یەکەم بە تەواوی تێهەڵکێشی نونی دووەم دەبێت و ئیتر (ضمّة)کە ناخوێنرێتەوە.

---

[207] بڕوانە لاپەڕە: ١٦٣

[208] بڕوانە لاپەڕە: ٤٢

[209] بڕوانە: البدور الزاهرە ل: ٢٨٨

[210] بڕوانە لاپەڕە: ١٢٨

کەواتە لە گەڵ (إشمام)دا تێهەڵکێش پێویستە لەگەڵ (روم)یشدا (إختلاس) پێویستە.[211]

٩- پیتی (عين) لە ﴿كٓهيعٓصٓ﴾[مريم:١]و، ﴿عٓسٓقٓ﴾[الشورى:١]، بە (٦) جووڵەو بە (٤) جووڵە دەخوێنرێتەوە.[212]

١٠- ﴿وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا﴾[الفرقان: ٦٩]، بە(فيهي مُهاناً) دەخوێنرێتەوە.[213]

١١- وشەی ﴿لۡـَٔيۡكَةِ﴾ لەئایەتی ﴿كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ [الشعراء: ١٧٦]، و﴿وَثَمُودُ وَقَوۡمُ لُوطٖ وَأَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِ﴾[ص: ١٣] بە بێ (ألف) نوسراونەتەوە، بەڵام لە هەردوو سورەتی (الحجر)و (ق)دا بە(ألف) نوسراونەتەوە، ﴿وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ﴾[الحجر: ٧٨]، ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖ﴾. لە هەر چواریاندا لە کاتی گەیاندن (الوصل) بە لامێکی زەنندارەوە دەخوێنرێنەوە، بەڵام لە کاتی دەستپێکردندا (الإبتداء) بە هەمزەیەکی سەردار (مفتوح)و بەدوایدا لامێکی زەنندار دەخوێنرێنەوە، واتە: (ألْأَيكة).[214]

١٢- لە کاتی وەستان لەسەر وشەی ﴿ءَاتَىٰنِۦ﴾ لە ئایەتی: ﴿فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم﴾ [النمل: ٣٦] بە دوو شێوە دەخوێنرێتەوە: بە پیتی (ي) دەخوێنرێتەوە، واتە: (آتاني)، هەروەها بە بێ پیتی (ي)ش دەخوێنرێتەوە، واتە: (آتانْ)، بەڵام یەکەمیان لە پێشترە.[215]

---

[211] بڕوانە: أحكام قراءة القرآن الكريم للحصري ل: ١٢٧و ٣٢٦-٣٢٧،

[212] بڕوانە لاپەڕە: ١٦٩.

[213] بڕوانە لاپەڕە: ١٧٢ .

[214] المنير في أحكام التجويد، ل: ٢٦٤.

[215] غاية المريد في علم التجويد ل: ١٦١.

١٣- هەر سێ وشەی (ضَعف) لە ئایەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ ضَعۡفًا وَشَيۡبَةً﴾ [الروم: ٥٤]، بە دوو شێوە دەخوێنرێتەوە.

أ- (ضَعف)، (ضَعفاً)

ب- (ضُعف)، (ضُعفاً)، بەڵام یەکەمیان لە پێشترە.[216]

١٤- لەم دوو شوێنەدا تێهەڵکێش ڕوو نادات بەڵکو نونە زەنگنەدارەکە ئاشکرا دەکرێت: ﴿يسٓ ۝ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ﴾، ﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾[217]

١٥- ﴿ءَا۬عۡجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ﴾ [فصلت: ٤٤]، تەنها بە (التسهيل) دەیخوێنێتەوە.[218]

١٦- لەکاتی دەستپێکردن (الإبتداء) بەوشەی ﴿ٱلِٱسۡمُ﴾ لەئایەتی ﴿بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ﴾[الحجرات: ١١] بە دوو شێوە دەخوێنرێتەوە:[219]

أ- (أَلِسْمُ).

ب- (لِسْمُ).

١٧ - لە کاتی گەیاندنی ئەم دوو ئایەتە ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّى مَالِيَهۡۜ ۝ هَلَكَ عَنِّى سُلۡطَٰنِيَهۡ﴾[الحاقة: ٢٨-٢٩] بە یەکتر بە دوو شێوە دەخوێنرێتەوە:

أ- وەستان لەسەر وشەی ﴿مَالِيَهۡۜ﴾ بەبێ هەناسە واتە (السّکت).

ب- تێهەڵکێشکردن (الإدغام) واتە بە (ماليهّلك) دەخوێنرێتەو، بەڵام شێوەی یەکەم لەپێشترە.[220]

---

[216] البدور الزاهرة في القراءات العشر المتواترة ل: ٤٧١

[217] بڕوانە لاپەڕە: ١٣٥

[218] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل: ٥٣٧.

[219] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل: ٥٧٢ .

[220] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل: ٦٢٥.

١٨- له كاتى وەستان لەسەر وشەى ﴿سَلَٰسِلَا۟﴾ لەئايەتى ﴿إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَا۟ وَأَغۡلَٰلًا وَسَعِيرًا﴾ [الإنسان: ٤] بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە: بە پیتى ئەليف و بە بىٚ پیتى ئەليفيش دەخوێنرێتەوە[٢٢١]

١٩- وشەى ﴿قَوَارِيرَا۟﴾ى دووەم له ﴿وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۟ ۝١٥ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٖ قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرٗا﴾[الإنسان: ١٥-١٦]، له حاڵەتى گەياندن و وەستانيشدا ئەليفەكەى ناخوێنرێتەوە، بەڵام ﴿قَوَارِيرَا۟﴾ى يەكەم له حاڵەتى گەياندندا ناخوێنرێتەوەو له حاڵەتى وەستاندا دەخوێنرێتەوە.[٢٢٢]

٢٠- وشەى ﴿نَخۡلُقكُّم﴾ له ئايەتى ﴿ أَلَمۡ نَخۡلُقكُّم مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ﴾ [المرسلات٢٠] بەدوو شێوە دەخوێنرێتەوە:

أ- تێهەڵكێشكردنى تەواو واته بە (نخلكّم) دەخوێنرێتەوە.

ب- تێهەڵكێشكردنى ناتەواو.[٢٢٣]

٢١- له كاتى وەستان لەسەر ﴿يُحۡيِۦ﴾و هاوشێوەكانى ئەگەر بەدوايدا پيتێكى بزواو (متحرك) هاتبوو، وەك: ﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾[البقرة: ٢٥٨] ياخود زەنندەدار هاتبوو بەڵام خۆى سەر (فتحة)ى هەبوو وەك: ﴿أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰۚ﴾ [الأحقاف: ٣٣] ئەوا پێويستە قورئانخوێن بەدوو (ي) له پاش پيتى (ح)وە لەسەرى بوەستىٚ ودەشبێتە درێژكردنەوەى جێگيركردن (مدّ التمكين)، بەڵام ئەگەر بەدواى ﴿يُحۡيِ﴾و هاوشێوەكانيدا پيتێكى زەنندەدار هاتبوو له هەمان كاتيشدا پيتێكى (ي) لەبەر حاڵەتى گەياندن (وصل) نەمابوو وەك: ﴿يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ﴾ [الروم: ٥٠]، خوێنەر دەتوانێت

---

[٢٢١] بڕوانه لاپەڕە: ١٥٣-١٥٤.

[٢٢٢] بڕوانه لاپەڕە: ١٢٦.

[٢٢٣] بڕوانه لاپەڕە: ١٢٦.

به یەك (ي) لەسەری بوەستیٚ لە بەر شوێنکەوتنی (الرسم)و، دەشتوانێت بەدوو (ي) لە سەری بوەستیٚ چونکە هۆکار نەماوە بۆ سڕینەوەی.[224]

٢٢- دروست نییە قوڕئانخوێن لەسەر (أو) لەم ئایەتانەی خوارەوەو هاوشێوەکانی بوەستێت چونکە (أو)ی پرسیار (الإستفهامية)ن و لەکاتی وەستان لە سەریان وەك (أو)ی ئامرازی لێکدەر (العاطفة)یان لێدێت.[225]

﴿أَوَأَمِنَ أَهۡلُ ٱلۡقُرَىٰٓ أَن يَأۡتِيَهُم بَأۡسُنَا ضُحٗى وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ﴾ [الأعراف: ٩٨]، ﴿أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ﴾[الصافات:١٧]، [الواقعة:٤٨]، ﴿أَوَلَمۡ يَرَ ٱلۡإِنسَٰنُ﴾[يس:٣٦]

---

[224] المنير في أحكام التجويد ل: ٢٦٢- ٢٦٣، إحكام الأحكام في تجويد تلاوة القرآن ل ٥٧.

[225] هەمان سەرچاوە ل: ٢٦٣- ٢٦٤.

سێیەم: سەنەدی (حفص):



چوارەم: ناوی دە قورئانخوێنەکان و ڕاویەکانیان:

| شار | قاریء | ساڵی کۆچکردن | ڕاوی | ساڵی کۆچکردن |
|---|---|---|---|---|
| مەدینە | ١- نافع | ١٦٩ ك | ١- قالون<br>٢- وَرْش | ٢٢٠ ك<br>١٩٧ ك |
| مەککە | ٢- ابن كثير | ١٢٠ ك | ١- البَزِّي<br>٢- قُنبُل | ٢٠٥ ك<br>١٩١ ك |
| بەسڕە | ٣- أبو عمرو | ١٥٤ ك | ١- الدُّوري<br>٢- السُّوسي | ٢٤٦ ك<br>٢٦١ ك |
| دیمەشق | ٤- ابن عامر | ١١٨ ك | ١- هشام<br>٢- ابن ذَكوان | ٢٤٥ ك<br>٢٤٢ ك |
| کوفە | ٥- عاصم | ١٢٧ ك | ١- شُعبة<br>٢- حَفص | ١٩٣ ك<br>١٨٠ ك |
| کوفە | ٦-حمزة | ١٥٦ ك | ١- خَلَف<br>٢-خَلَّاد | ٢٢٩ ك<br>٢٢٠ ك |
| کوفە | ٧- الكسائي | ١٨٩ ك | ١- أبو الحارث<br>٢- الدُّوري | ٢٤٠ ك<br>٢٤٦ ك |
| مەدینە | ٨- أبو جعفر | ١٣٠ ك | ١- ابن وَردان<br>٢- ابن جَمَّاز | ١٦٠ ك<br>١٧٠ ك |
| بەسڕە | ٩- يعقوب | ٢٠٥ ك | ١- رُوَيْس<br>٢- رَوْح | ٢٣٨ ك<br>٢٣٤ ك |
| کوفە | ١٠- خلف | ٢٢٩ ك | ١- إسحاق<br>٢- إدريس | ٢٨٦ ك<br>٢٩٢ ك |

**سەرچاوەكان:**


١- إحكام الأحكام في تجويد القرآن سيد جمعه سلاّم

٢- أحكام التجويد بدون مؤلف

٣- أحكام التلاوة عادل نصار

٤- أحكام قراءة القرآن الكريم محمود خليل الحصري

٥- أضواء البيان في معرفة الوقف والإبتداء جمال إبراهيم القِرش

٦- أطلس التجويد دار الغوثاني للدراسات القرآنية

٧- إِعانَةُ المستفيد بضبط مَتنَي (التُّحْفة والجزريَة) حسن مصطفى الوَرَّاقِيِّ

٨- برنامج أحكام التجويد

٩- البسيط في علم التجويد بدر حنفي محمود

١٠- تەفسیری ڕامان ئەحمەد كاكە محمود

١١- تيسير الرحمن في تجويد القرآن د. سعاد عبدالحميد

١٢- تيسير علم التجويد أحمد بن أحمد محمد عبدالله الطويل

١٣- الجامع الكبير في علم التجويد نبيل بن عبدالحميد بن علي

١٤- حق التلاوة حسني شيخ عثمان

١٥- الروضة الندية شرح متن الجزرية محمود محمد عبد المنعم

١٦- السلسلة الصحيحة محمد ناصر الدين الألباني

١٧- السهل المفيد فى أحكام التجويد إبراهيم أحمد

١٨- شرح رياض الصالحين محمد بن صالح العثيمين

١٩- صحيح أبي داود محمد ناصر الدين الألباني

٢٠- صحيح البخاري محمد إسماعيل البخاري

٢١- صحيح الترغيب والترهيب محمد ناصر الدين الألباني

٢٢- صحيح الجامع الصغير محمد ناصر الدين الألباني

٢٣- صحيح مسلم مسلم بن الحجاج القشيرى النيسابوري

٢٤- ضعيف الجامع الصغير وزيادته محمد ناصر الدين الألباني

٢٥- ضعيف وصحيح سنن ابن ماجة محمد ناصر الدين الألباني

**٢٦-علم التجويد د. يحيى عبدالرزاق الغوثاني**

**٢٧-غاية المريد في علم التجويد عطية قابل نصر**

**٢٨-فتح رب البرية شرح المقدمة الجزرية صفوت محمود سالم**

**٢٩-كيف تقرأ القرآن محاضرات الدكتور أيمن سويد**

**٣٠-لآلئ البيان في تجويد القرءان إبراهيم على شحاتة السمنودي**

**٣١- متن السلسبيل الشافي في علم التجويد عثمان بن سليمان مراد**

**٣٢-مذكرة في التجويد محمد نبهان بن حسين بن نبهان**

**٣٣-مسند الإمام أحمد بن حنبل مذيلة بأحكام شعيب الأرنؤوط عليها**

**٣٤-المفيد في علم التجويد شهاب الدِّين أَحمد بن بدرالدِّين الطِّيبِيّ**

**٣٥-المنير في أحكام التجويد جمعية المحافظة على القرآن الكريم**

**٣٦-الميسّر في علم التجويد عبد الله عبد القادر حيلوز**

**٣٧- نهاية القول المفيد في فن التجويد محمد نصر**

**٣٨- هداية القاري إلى تجويد كلام الباري عبد الفتاح المرصفي**

**٣٩-الوجيز في تجويد الكتاب العزيز د. محمد بن سيدي محمد الأمين**

**٤٠-الحروف العربية وكيفية أدائها بنت عبدالرحيم آل سليمان**

## ناوەڕۆک

**بەشی سێیەم :**



**بەشی چوارەم:**

بەشی هەشتەم :

بەشی نۆیەم:

جوانخوێندنەوەی قورئان
زمان تێیدا بەشدارە بەڕاستکردنەوەی پیتەکان،
عەقڵیش بەتێڕامان لەواتاکان،
دڵیش بەئامۆژگاری وپەندوەرگرتن.